- محمد حسانی الدسوقی -

# هاتووم ببمە سۆفی

- ڕۆمان -




وەرگێڕانی:

زامدار قادری

عەبدولرحمان حەمەدئەمین

ناسنامەی کتێب
ناوی کتێب: هاتووم ببمە سۆفی
نووسینی: محمد حسانی الدسوقی
وەرگێڕانی: زامدار قادری
عەبدولرحمان حەمەدئەمین
بەرگ و ناوەڕۆك: ئیبراهیم ساڵح
چاپی : یەکەم
ساڵی چاپ: 2023



ناوەندی رەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەو کتێبە لەلایەن احمد عبدالرحمن**
**کراوە بە pdf و پێشکەش بە خوێنەر کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7



# (١)

ئەمە سرووت و هۆنراوەی کۆمەڵێك لە پاکانە، کە جۆرێك لە ئارامی ڕوحی باڵی بەسەریانەوە کێشاوە، کە وەڵامدەرەوەی داخوازی هەمووانە. ئای چەندە جوانە ڕوح لە کەشێکی پاك و بێگەرد لە شەقەی باڵ بدات، گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت لە جەستە جیابێتەوە، هەر وەك چۆن ڕوح لە جەستە جیادەبێتەوە" بەم شێوەیە موریدان دەوری شێخەکەیان دەدەن و لە دونیا جیا دەبنەوە، ڕێك هاوشێوەی هەسارەکان" کاتێ دەوری خۆر دەدەن، و لە ڕووناکی و ڕۆشناییەکەی بەهرەمەند دەبن، کۆدەبنەوە و دەوری شێخەکەیان دەگرن، کتومت لەو وەسفانە دەکەن کە لە نێوان خۆیاندا بە دەربڕینی جیا بەکاریدەهێنن: ( مەی، مەیگێڕ، مەستان)، حاڵیان لەگەڵ ئەم دەستواژانە دێتەوە..

مەیگێر: "شێخ"ـە یان فێرکار و سەروەر و قسەکەریانە.

مەی: گوفتاری شیرینی شێخە و فێرکارە، لە ناکاو بەسەریاندا تێدەپەرێت و بە هۆیەوە کەمەندکێش دەبن، دەکەونە حاڵ تا لێواری بێهۆشبوون.

مەستان: ئەو کۆمەڵە کەسەی دەوری شێخن.

ئەمە دیمەنێك بوو لەو دیمەنە باوانەی ئێرە، کە ناوچەی سەعیدی میسرە، دێی "سەعید" سەر بەشاری ناوداری " ئەقسەرە"، بە تایبەت لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، ئەو شارە لەو سۆفیانە تژی بوو، لەگەڵ زۆری ژمارەیان" جیاوازیان لە حاڵ و پلەیاندا هەبوو، لە ناویاندا هەبوو موریدێکی

ڕاستگۆ بوو، هەبوو شێخێکی تەواو، خواپەرستی ڕاستگۆ و خواناسی بە ناوبانگ و دەروێشی هەژار هەبوون.

ئای خودا گیان دەبێ چەند پێکی خۆشەویستی لەو پارچە زەویەدا نۆشکرابێ! دەبێ ئەم دیوارە بێگوێیانە گوێبیستی بەرزبوونەوەی پلەی ئیحسانی چەند مورید بووبێ، ڕەنگە گەواهی ئامادەیی ئەوان بووبێت و بە سرودەکانیان کەوتبنە جۆش و خرۆش، پەیمانی پێکەوبوونی لەگەڵیان بەستبێت و ئاشقیان بووبێت، بە دیار نەمانیان تامەزرۆبێ و بنوزێنەوە.

سڵاو لەو زەویەی کە بەوانەوە بەرەکەتدار بووە و لەو مەنزڵەش کە سەرتاپای جوانیەکانی کۆکردۆتەوە و نهێنی ژیان و ئادەمیزادی ناسیوە.

لەگەڵ ئەوەی خۆم بە گەورە نازانم، بەڵام ئاماژە و نیشانەکانی ژیان گەواهیدەری ئەوەن کە هیچ کات خێر بە بێ شەڕ نابێت و ( هەرگیز ناکرێت خێرێك هەبێت خاڵیبێت لە شەڕ).

ڕەنگە بێگەردی برێك گەردی تێکەوتبێ، لەبەر ئەوە لەم گەردوونەدا خێری ڕەها بوونی نیە، هەروەك چۆن شەڕی ڕەهاش بوونی نیەز پەروەردگاری بە شکۆ حیکمەتەکانی بەم شێوەیەیە. لەتەك ئەو سۆفیە خواپەرستانە ژمارەیەك نەزان و دڵنەخۆش لە ڕیزی کۆمەڵەکە دەبینرێن و بەشێك نین لە کۆمەڵەکە، ئەمانە ڕۆڵەی دونیان، دونیایان کردۆتە بینایی چاویان و هەموو مەبەستیان.

ئەم کۆمەڵەیە لە سەرچاوەی ڕاستەقینەیان نۆشکردووە و دەروونیان رام بووە و هیمەتیشیان بەرز. خۆیان بە دوارۆژ لکاندووە، وازیان لە هەموو هۆکار و ئەو بەستەرانە هێناوە کە بە دونیایان گرێ دەدات. بەڵام ئەوانیتر ئامانجی هەرە گەورەیان بریتیە لە شتی بێنرخ و پوچ و دەستەکەوتی کەمبەها، لە نێوان ئەم

دوو کۆمەڵەیە جیاوازی زۆر و کەلێنی فراوان هەیە. جگە لەمە لە نێو ئەو خەڵکەدا سەرمایەداری باڵا و ناوەند و هەژاری داماو بێ دەرەتان هەبوون.

لە ناویاندا کەسانێك هەبوون پەروەرێن بە دەوڵەمەندیەکی خراپ تاقیکردبوونەوە، منیش ئەو پیاوە شەست ساڵییە خاوەن ڕووخسارێکی ئەسمەر و جامانە بەسەرەم هەبوو، خاوەن هێزێکی بە زەبر و پلەی بەرز بوو، کاتێ قسەی دەکرد" گوێڕایەڵی دەبوون، فرمانی بکردایە بێ سێ و دوو جێبەجێ دەکرا، تکای بۆ هەرکەس بکردایە" تکای وەرگیردراوبوو.

بە " حاجی سەیید" بانگیان دەکرد، خاوەن ماڵ و سەروەت و سامانێکی زۆر و زەوەند بوون، ئەو سامانەی لەو زەویان پەیدا دەکرد کە خۆی خاوەنیان بوو، هەروەها بازرگانیکردن بە حوشترەکانی سەرچاوەیەکیتری داهاتەکەی بوو. باوکی بە بچووکی کچەمامەکەی لێ مارەکرد، زۆری نەبرد لە دەیەی سێیەمی تەمەنی وەفاتی کرد و بەشێکی بچووکی خۆی بۆ بەجێهێشت کە ناوی نابوو " ئەحمەد" وەك ناوی باوکی. پاش ئەو جارێکیتر هاوسەرگیری کرد، ئەو جارەش بێ ئەوەی منداڵی لێی ببێت، لێی جیابوویەوە.

دوای ئەوە بڕیاریدا چاو لەسەر هاوسەرگیری هەڵبگرێت و ئەو تەمەنەی ماویەتی بۆ کوڕ و کارەکەی تەرخانی بکات. زۆرینەی ئەو کەسانەی لەسەر ئەو شێوازەن هیچ گرنگیی بە هەستەکان نادەن، گرنگی بۆ پەیوەندییە مرۆییەکان دانانێن. ئەویش بە ڕوانینی دونیا و کرانەوەی دەرووی خێر و خۆشیەکان و ڕووکارە فێڵاویەکەی هەڵنەدەخەڵەتا و لە ئامانجە باڵا و مەبەستە خوازراوەکەی دوور نەدەکەوتەوە.

باوك، تاقەكوڕ، سامانی بێشومار...

باوكەكە بە سامانەكەی كوڕەكەی تێر كردبوو، بۆ ڕازیبوونی ئەو" هیچ شتێك نەمابوو بۆی نەكات. نەیدەویست كوڕەكەی وەكو گەنجێتی خۆی لە زۆرشت بێبەش بێت، ئەمە تەنها هەڵوێستی ئەو نەبوو بۆ كوڕەكەی، بەڵكو زۆرێك لە دەوڵەمەندەكان هەروایان دەكرد.

نایانەوێت جگەرگۆشەكانیان ئەوە ببینن، ئەگەر پرسیاریشیان لێبكرێت، لەبارەی ئەمەوە" هەمان وەڵامە باوەكە دەدەنەوە: ( نامانەوێت ئەوەی ئێمە بە بچووكیی چە شتمان لە هەژاریی و ناخۆشیی ئەمانە بیچێژنەوە). ئەگەر كەمێك بیربكەنەوە دەبینن و دێنە سەر ئەو بڕوایەی گەر ئەو ناخۆشیی و نەبوونییە نەبووایە" بەم ڕۆژە نەدەگەیشتن كە ئەمڕۆ شانازیی پێوەدەكەن.

من بە شێوەیەك پێگەیشتم كە لە ڕووی ڕوحییەوە دۆڕاو و لە ڕووی مادییەوە تێر و تەژی بووم. بە ماڵ و سەروەتی باوكم لە هاوتەمەنەكانم جیادەكرامەوە. مامەڵەیەكی تایبەتم لەگەڵ دەكرا، لەبەر شتێك كە هی خۆم نەبوو و هیچ كۆششێكیشم لە پێناویدا نەكردبوو. بە هۆی پێگەی باوكم لە ناو خەڵكیدا نازداربووم. لەوكاتەدا سۆفیە خواپەرستەكان لە ئەهلی چاكەی گوندەكە" منداڵەكانیان لەسەر خێر و باڵایی ڕوحی و زاڵبوون بەسەر جەستە و تێكشكاندنی ئارەزووەكانیان پەروەردە دەكرد.

ڕۆژ هەبوو یەكجۆر خواردنیان دەخوارد، ڕۆژێتر دووان و ڕۆژێتر سێیان. جارێكیان نان و چەوری و جارێك بە تەنها نان. بەو شێوەیە منداڵەكە بە شێوەیەك پێدەگەیشت كە بەهای ئەو بەخششەی دەزانی كە بۆی دەردەست

دەبوو. گوێشـــی پێنەدەدا گەر ئەو بەخشـــشـــە ڕووی لێوەرگێڕابووایە و لای نەمابووایەوە، بەڵکو ئارامی دەگرت و بەسەر نەفس و ئارەزووەکانیدا زاڵ دەبوو.

گەیشتمە تەمەنی سی و دووساڵی و هەر لەسەر ڕێچکەی باوکم بووم. لە ڕۆژدا لەناو زەویی و بازرگانیی و مەڕو ماڵات و حوشـتر بووم و لە شـەویشـدا خەریکی ڕابواردن و مانەوە لەگەڵ دۆستانم بووم.

ئەوە ژیانم بوو، ئەمەش ژیانێکی ئاسـاییە بە ڕەچـاوکردنی ئەو ژینگەیەی لێی گەورەبووم. ئایین هیچ دەسەڵاتێکی بەسەرمەوە نەبوو، هیچ کەس و هیچ شتێك نەبوو ڕێگری کارەکانیم بکات، دینداری وەك بیرۆکە" بۆ چەند خولەکێکی کەم بە ئاوەزمدا گوزەری دەکرد.

ئەوەی کە دیار و ئا شکرایە بریتییە لەوەی کە **"دونیا تا سەر بۆ کەس نیە، گەر بەردەوام بووایە و بۆ کەس بووایە نەدەگەیشـتە ئێمە"**. بۆ دڵدانەوەی هاوڕێکانم یان کاتێك بە چـیرۆکی یەکێك لە هاوکۆڕ و دانیشـتـنەکانم کاریگەر دەبووم، زۆر ئەم ڕستـەیەم دەگووتەوە، بەڵام جیاوازیەکی زۆر و فراوان هەیە لە نێوان ئەوەی دەیبیستیت و ئەوەش کە خۆت تیایدا دەژیت.

باوکم نەخۆشـــیەکی ســـەختی گرت، وایلێکردم بۆ ماوەیەکی کورت لە کنی بمێنمەوە، پزیشـکێك دەڕیشـت و یەکێکیتر دەهات، میوانێك دەهات و یەکێکیتر دەردەچـــوو. کاتێك هیچ ڕێگە یەك نەبوو لە قەدەری مردن دەربازی بکات" وەفـاتیکرد و هـەرچـــی بـە درێـژایی ژیـانی کۆیکردبوویـەوەلـە دوای خۆی بەجێیهێشت.

ئەو بۆی دڵتەنگ بووم و دونیا لە بەرچـــاوم تەنگ و ڕەش بوو. بیرۆکەی گومانناوی ترســـناك یارییان پێدەکردم، خەریکبوو بەرەو بێباوەڕیم ببەن. باوکم قەڵغانێکی پۆڵایین و قەڵایەکی پارێزەر بوو. هەستم بە ونبوونی هەموو شتێکی دەوروبەرم دەکرد، بەهای دونیا لە چـیدایە کاتێك دەرەنجامەکەی کۆتاییهاتن بێت؟ بە های دونیا چیە کاتێك بەرە و نەمان و لە ناوچوون دەچێت؟

چـــەند گومانێکی شـــەیتانی بەرۆکی گرتبووم، جارێك هەســـتم دەرکرد کە خۆشـبەختیی و دڵتەنگی" تەنێ دوو ڕووی دراوێکن و هیچـیتر، کاتین و نامێنن. جاریش وابوو گومانم لەســـەر بوونی درووســـتکارێك کە کاری دروســـتکراوان بەڕیوەببات" بۆ درووســـتدەبوو! ئەو ترس و ئەو هێدمەیە دوای مردنی باوکم تووشـــم بوو، وایلێکرد خاوەن دەروونێکی ڕووخاو بم، توانای بەرەنگاربوونەوەی ڕووداوەکانم نەبوو. ئەگەر بەزەیی خودا نەبووایە" دەکەوتمە نێو چــەپۆکی شەیتانەوە، بەڵام خودا سەلامەتی کردم. ئەمە بەخششی خودایە لە سەرم، لە هەموو بارێکدا سپاس و ستایش هەر بۆ خودایە.

مردنی باوکم وەك برووســـکە وابوو. خۆزگە پێش ئەو ڕووداوە بیرم لێکردبایەوە، بۆ ئەوەی نەبووایە ڕووداوێکی لە ناکاوی پڕ لە ئێش و ئازار. لەو کاتەدا نغرۆی هێدمەکەم بووم، سەرسام بووم و لە گێژاوی خەم و خەفەتدا ڕووچووبووم. لەناو ئەو پارچە زەویەی خۆمان" کە کەوتبوویە تەنیشت ماڵمان، ڕەشماڵی پرسەکە جێگیر کرابوو، بەردەوام لەوێبووم، پرســەکە ماوەی ســێ شـــەو ڕۆژی خایاند. ئەوانەی بۆ ســـەرەخۆشـــی دەهاتن" توانیان لەوماوەیەدا بەشـــێك لە خەم و پەژارەکەم لەسەر سوك بکەن.

ڕۆژانی پرسە تەواوبوون و ماوەی زۆر خراپتر دوای پرسەکە دەستی پێکرد. بێگومان دەکرا بە ڕازیبوون و خۆبەدەستەودان ڕووبەڕووی ئەو کارەساتە ببمەوە، دەمتوانی بە دڵ ڕووبکەمە خودای خۆم، بەڵام هیچ لەوانەم نەکرد، ڕێك بە پێچەوانەوە" خراپە کاریی و خۆ بەزلزانیم زیادییکرد، دەرگام بە ڕووی داواکاریەکانی نەفسم والآکرد. بە خواردنەوەی مەی زێدەڕۆییم دەکرد و بەردەوام بووم لە سەر خەراپە، بە سەردانیکردنی خانەی مەیفرۆشان و دانیشتن لەگەڵ بەدڕەوشتان ڕاهاتبووم، بێگومان هیچ هۆکارێکی درووستم بۆ ئەو ڕەفتارانەم نەبوو، بگرە ئەنجامەکەشی پەسەند نەبوو.

بەوەندە نەوەستام و کاری بەدرەوشتیم تێپەڕاند- پەنا بەخودا- ئەوە دووجار ڕوویدا: یەکەمیان مانگێك دوای وەفاتی باوکم بوو، کاتێك هەندێك لە هاوڕێکانم پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردم کە پێویستم بە ئاسوودەکرنی دەروونم هەیە، لەبەر ئەوە لەگەڵیان چووم بۆ قاهیرە و لەوێ ئەو کارە ڕوویدا، جاری دووەمیشیان لەگەڵ یەکێك لەو ئافرەتە بەدڕەوشتانە بوو کە بە لادێکەمان بێگانە بوو.

هەرکاتێك بەرەو ئەو جۆرە کارانە دەچووم، لە ساتی ئەنجامدانی هەڵەکە هەستم بە ئاسوودەیەکی ساختە دەکرد، کەمێك دوای ئەوە دەکەوتمە سەرزەنشتی خۆم و پاشان دەگەڕامەوە سەر کارەکە، ئەمە هەمووجارێك دووبارە دەبوویەوە. سەرەڕای ئەم هەموو بە فیڕۆدانە" بۆ ژیانە پەرتەوازەکەم زۆر بیرم لە چارەیەك دەکردەوە. هەرگیز لە ژیانمدا خۆم بۆ ئەمە ئامادە نەکردبوو، هیچ کات

نەدەترسام بژێویم بە شێوەیێك لە شێوەکان کەم بکات. بە دوای چارەیەك دەگەڕام، وام لێبکات بە سینگێکی فراوان ڕووبەڕووی ڕووداوەکان ببمەوە.

شەیتانەکەم ختورەی بۆ دەهێنام و دەیچرپاندە گوێم، کە مردن هەیە و هیچ گومانی تێدانیە" ئەوا دەبێت چێژ لە هەموو ساتەکانی ژیان ببینم. جا ئەو چێژە بە حەلاڵی بێت یان بە حەرامی.

بەلام من دەگەڕامەوە و باوکم بیر دەهاتەوە. ئەو زۆربەی کاتەکانی لەو کارانە بە سەر دەبرد کە من ئێستا ئەنجامیان دەدەم، لەگەڵ ئەوە شدا لە سەرەمەرگدا ئازاری زۆری دەچەشت و ئەو چێژانەی ڕابردووی هیچ بە هانایەوە نەهاتن. بگرە ئەفسووس و داخی زیاتر کردبوو، جگە لەمە لە ترسی ئەو کارانەی کە لە ڕابردوو ئەنجامی دابوون و لە ترسی ئەوەش کە چاوەڕێی دەکات لەو دیو دونیا" تەواو تۆقیبوو.

ژیانی مرۆڤ بە مردن ناوەستێت، ئەمە لە ئایینەکەشماندا بە ئاشکرا ئاماژەی پێدراوە، بەڵکوو بە بۆچوونی ئەوانەش کە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە" مردن لای ئەوانیش شتێکی ناخۆش و نەویستراو بووە.

ئەو لێشاوی بیرکردنەوەیە بە خەوێك کۆتایی پێ نەدەهات و هەموو ئەوانەی لە بیر نەدەبردمەوە و حاڵ و ژیانم وەك خۆی دەمایەوە.

ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەو حاڵە مامەوە، هەتا ڕۆژی بەختەوەریم هات، ئەو ڕۆژەی کە لەودیوی پەنهانەوە وام بۆ دانرابوو کە دەستم بگرێت تا ئەو شوێنی کە پەردەکان لادەچن و ڕێگەی پێدەدرێت لەو دەرگە بچمە ژوورەوە، کە ژیانێکی پاکی لێیەوە دەستپێدەکات.

دێیەکەم- هەروەك باسمکرد- ژیان ومالّی زۆرێك لەوانەی تێدابوو کە بۆ خودا سولّحا و خۆپارێز و خواپەرست و پالّەفتەبوون، هەروەك چۆن کۆمەڵێك لەوانەشی لێبوو کە دونیایان پشتگوێ خستبوو، ڕوویانکردبوویە پەروەرێنی خۆیان و مەبەستیان ڕازیبوونی ئەوبوو. لە سەرەتادا هیچ بەهایەکم بۆ ئەوانە دانەدەنا و زۆرجاریش گالّتەم بە گوێڕایەڵی ئەوان بۆ شێخ و مامۆستاکەیان دەکرد، چوون تەواوی کارەکانیان بۆ لای ئەو دەگەڕاندەوە، ئەوەم بەبێ کەڵك بێ مانا دادەنا.

گالّتەم بە کۆڕی زیکر و سرودەکانیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەی هەندێکجار دڵ و گوێم پێی خۆشدەبوو.

سەیرم لەوە دەهات کاتێك بە درەنگانی شەو گوێم لە دەنگی ئەو خواپەرستانە دەبوو" گەردوونیان پڕ دەکرد و دڵەکانیان سەراسیمەی خۆی دەکرد، بە زوبانی حاڵ بانگی دەکرد هەتا ئاسوودەی و شادیی بە دیبکەن.

سەیرم بە حالّیان دەهات، بە ویرد و دامەزراویان، بە ئەدەب و ڕەفتاری جوانیان، بە پەروەردە و یەکلاییی بوونەو و پالّەفتەبوونیان، بە حاڵ و پاراستنی نهێنیەکانیان!

ئێستا دان بەوە دادەنێم کە گالّتە و بەکەم سەیرمکردوون، بەلّام هەرگیز ڕقم لێیان نەبوو، بە پێچەوانەوە خۆشمدەویستن.

پێویستم بەوان هەبوو و نەشمدەزانی، پێموایە ئەوانیش ڕق و کینەیان بەرامبەر بەکەس لە دڵدا نەبوو. چۆن دەکرێت نەخۆشیی ڕێگەی بکەوێتە ئەو دڵە پاك و دروستانە!

پێش مردنی باوکم، کاتێ چەند ڕێگریەکی ئایینی هەبوون لەوەی بچمە مزگەوت، ئەوکات ئەو دەروێشانەی لەو شوێنەبوون دەوریان دەدام و سڵاوی گەرمیان لێ دەکردم و بە دڵخۆشییەوە بە ڕوومدا بەزەیان دەکرد، مینا هاوڕێیەکی دێرین چاوەڕێیان دەکردم.

بەڵێ" خۆشمدەویستن و ئەوانیش منیان خۆشدەویست.. ئەمە ڕاستییێکە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆری ڕوحم هەڵات، بۆ ئەوەی تاریکایی ئەنگوستەچاوی دڵم لابدات و ئەو پەڵە ڕەشانەی کە لەسەر دڵم کەڵەکەبوون ڕامالێ. ئەمە لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوویدا.

یەکەمیان هەنگاو لەو ڕێیەی کە ڕێبوارانی تەریقەت پێیدا ڕەتدەبن بریتیە لە تەوبە و گەڕانەوە، گەر تەوبەکەی ڕاستەقینەبێت" بێگومان کاریگەریەکانی لەسەر کەسی تەوبەکار دەردەکەون و بەرووبوومەکەی هەستی پێدەکرێت. تەوبەکەی بەردەوام بۆ پلەی باڵا و باڵاترین بەرزی دەکاتەوە، بۆ پلەی زوهد- خۆی بۆ خواپەرستی تەرخان دەکات-، گەر لە زوهدەکەی ڕاستی کرد و بەردەوام بوو بۆ پلەی وەرع- لەگەڵ خواپەرستی خۆی لە گوناهیش بەدوور دەگرێت- بەرز دەکرێتەوە، بەو شێوەیە کەسی ڕێبوار و تەوبەکار بەو پلانەدا بەرزدەکرێنەوە.

ئەو کەسەی بەو پلە باڵایانە بگات، لە خەڵکی تر بێ منەت دەبێت، بۆیە ئەمان ڕووناکەنە ڕووی خەڵی، بەڵکوو ڕوویان تەنها دەکەنە پەروەردگاریان، هەروەکوو وتوویانە:

ئەمانە کۆمەڵێکن ویستیان تەنها بە خوداوە گرێداوە

ویست و پێویستیەکانیان نابەنە لای هیچ کەس

*داوای ئەمان خودای پەروەردگاریانە*

*چەندە جوانە ویستیان کە تەنها خودای تاك و تەنهایە*

بەلآم بەر لە تەوبە" دەبێت هۆکارێك بۆ گەڕانەوەکە هەبێت و دڵی مورید تەواو داپۆشــێت، ئەو هۆکارە نیگەرانی بکات و تەواوی بوونی بخاتە هەژان و بەرەو خودای پەلکێش بکات.

ئەو هۆکارە خودا دەیهاوێتە دڵی بەندەکەی، بەبێ ئەوەی هیچ پێشــهاتێکی پێشــوەختە هەبێت، بەندەکە بەو هۆکارە لەوکات تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە لای خودا.

دەکرێ ئەمەی دەستکەوێ لەو شوێنانەی کە تیایدا سەیری خوداناسێکی کردووە یان خواناسێك سەیری ئەوی کردووە، سەیرکردنی مورید بۆ خواناس بە چاوی ڕێز و گەورەییە، سەیرکردنی خواناسیش بۆ مورید بە چاوی سۆز و میهرەبانیە.

دەکرێ ئەوەمان لە بەدواداچوونی حاڵی چاکەکاران و چاولێکردنیان یان سەیرکردن و خوێندنەوەی پەرتووکەکان و ژیانیان دەستبکەوێت، چونکە باسکردنیان پاککەرەوەی دڵە .

# (٢)

لە ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزان" نەفســـم پێداگیری خواردنەوەی مەی بوو، ئەمە بۆ کە سێکی ڕووو چوو لە گوناه و تاوان کارێکی نامۆ نیە، تا زیاتر لە ناو گوناه بیت ساناتر لەگەڵ گوناهکردن ڕادێیت و گرنگی بۆ سنوورەکانی خودات لەکن نامێنێ و گوێی پێنادات.

دوای ئەوەی جڵەوم دابوویە دەست نەفسم، ئەو نەفسەی لە خەراپە ڕووچوو بوو و هەمیشە پێشڕەوی دەکردم بۆ ئەو کارەی کە بەرەو هەڵدێر و لەنا چوونی دەبردم.

لەنێو ماڵەکەم بە دوای شـوشـەیەکی پڕ یان پیاڵەیەك دەگەڕام، هیچ شـتێکم لەمانە دەســـتنەکەوت. کەوتەبیرم کە هاوڕێیەکم هەیە و لە دەورووبەری دێیەکە نیشـــتەجێ دەبێت" پێشـــتر بۆ کڕینی چـەند شـــووشـەیەك هاوڕێیەتیم کردبوو، لەوانەیە هەندێك لەو شووشانەی مابێت. بۆ داواکردنی شووشەیەك چوومە لای، ئەو ڕەتی نەکردەوە و بە بزەوە وەڵامی دامەوە و دانەیەکی پێدام.

شووشە بە پەڕۆ ڕەشە داپۆشراوەکەم هەڵگرت و بۆ کێڵگە بچووکەکەم بەڕێ کەوتم، کێڵگەکەم نزیك ماڵی هاوڕێیەکم بوو، لەدوواوە دەیڕوانییە ســەر هێڵی شەمەندەفەر.

هەستی بە کۆیلەبوون بۆ شتان چەندە بێنرخ و هیچە، بەتایبەت کە دەبێتە کۆیلەی ئارەزوو و فرمانەکانی نەفس.

چــوومە ژێر ســایەی دارێك، کە کەوتبوویە کۆتایی کێڵگەکە و هێڵی شــەمەندەفەریش دەکەوتە پێشــم، ئەوەم بۆ ئەوەبوو تا کەس نەمبینێ، پێك دوای پێك مژوڵی خواردنەوە بووم.

لەو دەمەی لەو حاڵەدابووم" پیاوچــاکێکی لادێکە بەلامدا تێپەڕی، خەڵکی لەبارەی ئەو پیاوە دەیانگوت: لە کەســە تایبەتیەکانی خودایە! دەمبینی لە نێوان هێلە ئاسنینەکە ڕێیدەکرد و گۆچانێکی گەورەی بە دەستەوەبوو.

سەرزەنشتی خۆم دەکرد و خۆم لێیشاردەوە، پشتم دابوویە قەدی دارەکە، بەرامبەرم هێڵی ئاســنینی بوو و پیاوەکەش بە نێو هێڵەکەدا بەرەو ڕووم دەهات...

نەمدەزانی چ شــتێك ئەوی هێناوەتە ئێرە و لەو دەمەدا لێرەدا چــیدەکات!، هەر کە لە دوورەوە بینیم" ئەو دەنگە شــاراوەیەی ناخم وەدەنگهات، ئەو دەنگەبوو دەیچرپاندە ناخم و بۆ بەگژاچوونەوەی نەفسم پاڵپشتی دەکردم، مینا کەسێکی ڕەخنەگر لەبەردەمم دەپرنگایەوە.

بەڵام بە خۆبەزلزانیی و سەرکەشیەکەم ئەو دەنگەم خامۆشکرد، شووشە "مەی" یەکەم لە دوواوەم شاردەوە، چاوەڕێم کرد تا شێخ تێپەڕێ و دووبارە دەستم کردەوە بەو کارەی کە بە بێئاگایی و نەزانیەوە دەستم پێکردبوو.

شێخ لە هێڵی ئاسنینەکە ڕەتا و بەرەو ڕووم هەنگاوی دەنا.

بۆ هاتنەکەی ئاهێکی توندم هەڵکێشا، ئێستا کاتێکی گونجاو نیە بۆ گوێگرتنی ئامۆژگاری، تەنانەت کاتی سلاوکردن و داواکردنی شتیش نیە.

سەرەڕای جیاوازی ڕێگە و ئاراستەمان" پەیوەندی من بەو شێخە و تەواوی پیاوچاکان و پاکان پەیوەندی خۆشەویستی دوولایەنە بوو، لەنێوان من و هەریەك لەوانە هیچ جۆرە ڕق و دوژمنداریەك نەبوو.

هەر کاتێك ئەو کەسە پیرۆزە نزیکتر دەبوویەوە زیاتر دەچوویە ناو سۆز و هەستەکانم، وەکو تێکەڵەی شلەمەنیەکان تێکەڵ دەبوون، لە کۆتایی ئەو تێکەڵیە و شکۆی ئەو شێخە هیوام دەخواست زەویێ لەت بووایە و خۆم و تاوانەکانم ونبوونایە.

لێم نزیکبوویەوە، شوێنەواری ڕووە نورانیەکەی جوانی و شکۆی پەخش دەکرد، ئاوێنەی دڵێك بوون کە تژیبوو لە خۆشەویستی تەواوی خەڵك. ئا ئەوەیە بە نەرمی هەنگاو دەنێت، قەمیسە درێژەکەی پۆشیوە و جامانە گەورەکەی بەستووە و گۆچانەکەشی بە دەستەوە گرتووە.

وا پێویست بوو بۆ نیشاندانی ڕێز و سلاو هەڵبستمەوە، کەچی ئەمەم نەکرد.. ئەمە بە هۆی خۆبەزلزانی و کەمڕێزیم بەرامبەر ئەو نەبوو! بەڵکوو لەبەر ئەوە

بوو کە شکۆی ئەو جوڵەی لێ بڕیی بووم! بە هۆی زاڵبوونی ئەو بوو بەسەر دڵم و بەسووك سەیرکردنی حاڵم بوو.

لە شەرمی کارەکەم سەرم شۆڕ کردبوو، نەمدەتوانی هیچ بکەم تەنها ئەوە نەبێت چاوەڕێ بکەم ئەو قسە بکات! چاوەڕێم دەکرد گوێم لە سەرزەنشتەکانی بێت.

لێم نزیکبوویەوە و بەسەر ئەژنکانی دانیشت، لە چاوانیدا نیگای سۆز و میهرەبانیم دەخوێندەوە، نیگای بەزەیی و خۆشەویستیم بەدیدەکرد، نەك ترس و تۆقان و هەڕەشە.

ئەو وەکوو ئەو کەسانە نەبوو کە هونەری ڕازاندنەوەی وشەکان بەکاردێنن، ئەو بە خۆبەزلزانی نەدەدوا و ڕوحی وشەکانی نەدەکوشت و خەڵکیان بەبیستنی وشەکانیان بێزار نەدەکرد.

سەیدەکە سلاّوی لێکردم و ڕستەی " کوڕەکەی خۆم"ی بە سلاّوەکە لکاند، مینا کەسێکی بە سۆز و میهرەبان دەستی خستە سەرشانم. وەلاّمی سلاّوەکەم دایەوەو زەردەخەنەیەکی ساختەم بە لێوەکانم نیشاندا.

دوای ئەوە شێوازی دانیشتنەکەی گۆڕی و هەروو ڕانەکانی بە سکیەوە نوساند و بەبەزەییەوە ئامۆژگاری کردم و گوتی:

- ئەوەندە بەس نیە کوڕەکەم؟

لە ئاماژەکەی گەیشتم. سەرم دانەواندە نێو کۆشم. بە هۆی ئەوەوە دڵتەنگ نەبووم کە شێخ بەو حاڵەی بینیم، بەڵکوو بۆ ئەو دۆخە خەمبار بووم کە ژیانمی تێکەوتبوو.

پێمگوت: بە خودا قوبان نازانم..

ڕوانینەکانی بەرامبەرم درێژەی کێشـــا و بەڕێز و بەزەییەوە دەیڕوانی، ئارامی هەموو بوونی ئەوی داپۆشیبوو، بە جۆرێك منیشی مینا خۆی داپۆشیبوو.

گوناهەکانم منی لەبەر چـاوی ئەو نەخستبوو و بە سووك سەیری نەدەکردم، بەڵکوو یارمەتیدام لە خەوەکەم بە ئاگابێم، ڕوحی بە بەراکردمەوە و ویستی ژیانی لا زیندوو کردمەوە، ژیان لەلام زیاتر جوان بوو، ئەمە وای لێکردم بە خۆمدا بچمەوە و سەر لەنوێ بە کارەکانمدا بچمەوە.

هیواخوازبووم لەگەڵ خۆی بمباتەوە ماڵەکەیی و فێرم بکات چۆن دەستبکەم بە ژیانێکی خۆش و پاك و بێگەرد، چۆن بتوانم مانای مرۆڤبوون لە خۆمدا زیندوو بکەمەوە کە عەیامێکە ماندوو و ون بووە، وام لێبکات لە مەبەســـتی بوون و درووستبوونم لەم ژیانەدا تێبگەم.

پێی گوتم: کوڕەکەم گوێبگرە، تۆ ئەوەندە خراپ نیت کە وا گومان دەبەیت، یان شەیتانەکەت وا بۆت وێنا دەکات و لە گەیشتن بە ڕێگای ڕاستی بێ ئومێدت دەکات. بەڕاســـتی تەمەن دەڕوات و هیچ گومانێکی تێدانیە، خۆشـــیەکان لەبیر دەکرێن و ڕۆژە پڕ چـــێژەکان کۆتاییان دێت و هەمووان بەبێ جیاوازی کۆچ دەکەن. تەنها داوات لێدەکەم بە ڕاستگۆیی لەگەڵ خۆتدا دابنیشیت.. هەرچەند ئامۆژگریت بکەم" وەکوو ئەوە نیە بە تەنها سەعاتێك لەگەڵ خۆتدا دابنیشیت و لە حاڵی خۆت ڕابمێنیت و بیر لە داهاتووت بکەیتەوە، ئەوەی من بە ئەندازەی سەعاتێکی بە تەنها مانەوەی تۆ گۆڕانکاری درووست ناکات، بە باشی ئەوەت لە بیربێت کە ئەوەندە خراپ نیت هەروەکوو وا گومان دەبەیت.

دوای ئەوە" بە نەرمی دەستی ڕاستەی گرتم و بە دەستی چەپەی بە نەرمی و خۆشەویستیەوە کێشای بە پشتەدەستم و خوداحافیزی لێکردم.

سەیر ئەوەیە ئەو وشانەی ئەو شێخە چرپاندیە گوێم، پێشتر چەندینجار لەو شانەم ژنەوتبوو، بەڵکوو ئەوەی نوێ بوو ئەو نیگا پڕ لە بەزەیی و میهرەبانیەی بوو، کە وای کرد شۆڕشێك درووست بێت و جووڵە بخاتە دڵم و هەموو ئەو تەپ وتۆزە کەڵەکە بووە ڕابماڵێ.

شێخ ڕۆیشت و منیش نغرۆی قوڵایی دەریای بیرکردنەوە بووم، جەنگێکی فراوانی بیرۆکەکان لە ئاوەزمدا هەڵگیرسا ,.. مینا چەند کەسیك بوون لە ناوەوەم بەرگریان لە بۆچوونەکانیان دەکرد، یەکێ دەیگوت: هەر بەڕاستی لە بنەڕەتدا بۆچی درووستکراوی؟ یەکێکیتر دەیگوت: ئەرێ چەند تەمەنت لە سەرگەردانی پوچ و بەتاڵیدا بە هەدەردا؟ ئەو بیرۆکانەم وەکوو شەپۆلی دەریاییێکی بێ کەنار شەپۆلیاندەدا.

دوای تاریکی ئەنگوستەچاوی شەو" هەر دەبێت سپێدە دەرکەوێت، تاریکترین کاتەکانی شەویش ئەوکاتانەن کە دەکەونە بەرەبەیان.

وشەکانی ئەو پیاوچاکە بەردەوام لە گوێچکەمدا دەزرنگێتەوە، بویە هۆی ئەوەی گڕی شۆڕش و دڵگەرمی لە ناخمدا هەڵبکات و دەست بکات بە گۆڕانکاری، دەبووایە وتەکانی ئەو پیاوچاکەم بە هەند وەرگرتبووایە" چوون وتەکانی ئەو پیاوچاکە وەکوو نامەیەك بوون لە ئاسمانەوە نێردرابن.

ئەو ململانێییە بەوە کۆتایی هات کە دەبێت هەر بگەڕێمەوە.

بێگومان دووری قورس و گرانە، پێویســـتی بە گۆڕانکاریەکی گەورە هەیە، بۆ ئەوەی هەموو ئەو ڕۆژ و شــەوانەی کە لەکیسـم چـووە قەرەبووی بکەمەوە، بیرمکردەوە کە ڕێگەی ئەو سـۆفیانە بگرمەبەر، ئەو سـۆفیانە کە هەر کەسـێ لایان دانیشـێ سـەرەڕۆ و بەدبەخت نابێت، بۆچی یەکێ نەبم لەو کۆمەڵە چاك و خۆپارێزانە؟

بە ویســـتی خودا" دوای ئەو هەڵوەســـتە و ئەو هۆکارە، کاتی ئەوەبوو بگەڕێمەوە. تەوبەم کرد و لەوەی پێشـــووم پەشـــیمانیم دەربڕی، پێداگیربووم لـەوەی لـە دەرگـاکـە بـدەم، دەرگـای ئـەو کۆمـەڵـە سـۆفیـانـە، بـە هیوای وەدەستخستنی نور و دۆزینەوەی ڕێی ڕاست.

لەو ڕێیە هیچ شـتێکم بۆ نەمابوویەوە جگە لە پەروەردەکارێك نەبێت، بەڵێ پێویستە شێخ و چاوساخ و پەروەردەکارێکی شارەزا بەو ڕێیەم هەبێت، بە تەنها ناگەمە مەنزڵ، پێناگەم.

ئەو ڕێگەیەی بە نیاز بیگرمەبەر" پڕە لە مەترسـی و ترس و خلیسـکان. ئەو کەسەی دەیەوێ ئەو فەوتێنەرانە ببڕێ" پێویستی بە کەسێکە چاوساخی بکات و ڕێگای ئارام و ئاسایشی پێنیشان بدات.

گڕی پە شیمانی لە جە ستەمدا دایسا، بۆ ئەوەی پەڕاوە ڕە شەکانی پێشووم بسڕیتەوە و زێدەڕەویی و کەمتەرخەمیەکانیشم بپێچێتەوە.

وەك بۆم دەرکەوت ئەو ئاگرەی لە ناخمدا دایســاوە" بەرهەمی ئەو پەیمانەمەیە کە لە داوی نەفســەکەم ڕزگاری کردم، ئەو نەفســەی کە بەردەوام فرمانی ئەنجامدانی خراپەی پێدەکردم.

ئەوكات باوكمم بیركەوتەوە... چـی دەبوو ئەگەر باوكم باشـتر منی پەروەردە كردبووایە؟.. چـی دەبوو ئەگەر منی ئاشـنای یەكێك لەوانە كردبووایە و لای ئەوانە پەروەردە كرابوومایە.. بە هەرحاڵ خودا لێیخۆشـبێت، ئێسـتا خۆیی و كردەوەكانی.

ئەڵاهو ئەكبەر.. ئەڵاهوئەكبەر..

دەنگی بانگبێژ بەرزبوویەوە و بانگی عەسـری دەفەرموو. هەسـتم بۆ نوێژ و تامەزرۆییم بۆ وەستان لەبەردەمی خودا دەجۆشا.

لە ڕێگای چـوونەوەم بۆ ماڵەوە" بەلای مزگەوتدا تێپەڕییم.. حەزمدەكرد بچوومایە ژوورەوە، بەڵام هێشتا نا. دەبێت پێشوەختە خۆم بشۆم و خۆم پاك بكەمەوە- جەسـتە و ناخم-ئەوكات دەچـمە ناو ماڵی خودا، ئەو شـوێنەی كە ئەوی لێیە و نزیكترین شوێنە لێیەوە.

دەلحاز چـوومە ماڵەوە و خۆم شـوشـت، دواتر پێیەكانم بەرەو لای شـێخە خۆپارێزەكە پەلكێشیان كردم، ئەو شێخەی پێش كەمێك بە دیداری شادبووم.

بە هێوری و ئارامیەوە لە دەرگامدا و كورە بچـووكەكەی دەرگای كردەوە و دواتر گەڕایەوە تا هەواڵی هاتنم بە باوكی بدات، كەمێكی پێچوو شێخ دەركەوت، تەنها بە بینینم زۆردڵخۆشبوو، چ دڵخۆشبوونێك!

پێشوازی لێكردم و بە توندی لە باوەشیكردم و دەستی گرتم، وەكو كەسێكی بەندكراو بە هێواشی" بێ ئەوەی وشەیەك دەرببڕم لەگەڵی چوومە ژوورەوە

چووینە ژوورێكی تەسكی بچووك، كە دوو قەرەوێڵە و چەند گۆشەیەكی لێبوو. زەویەكەش بریتی بوو لە قوڕێكی ڕەق و پتەوی ڕاخراو بە زەویەكەدا.

شێخ بە بزەوە سەیری کردم و گوتی:

- کوڕەکەم پێموابێت بڕیاریتداوە سەر لە نوێ دەست بە ژیان بکەیتەوە و هاتوویت تا گەواهی لە دایکبوونەوەت تۆمار بکەیت، ئەی وانیە؟
- گوتم: ئینشائەڵلا قوربان، هەر بۆ ئەوە هاتووم.
- گوتی: ڕۆڵە سوود و پەند وەگرتن بە ویست و پێداگیریەکی ڕاستگۆیانە دەبێت، سەرفرازیی و پارێزراویش بە فرمانی خودایە، بە بیرت بێت کە پەروەردگار -ئەگەرچی پێویستی بە تۆ نیە- بەڵام بێگومان بە تەوبە و گەڕانەوەت دڵخۆشدەبێت. تۆ لای ئەو خاوەن پێگە و بەهایت، ئەگەر ڕاست بکەیت پیرۆزت بێت ئەو دڵشکانەت، ڕۆڵەکەم بزانە کە پەروەردگار لەگەڵت میهرەبانترە لە دایک و باوکت. ئەوەی لای پەروەردگارە بە گوێڕایەڵ بوون نەبێت بە دەست نایەت.
- گوتم: قوربان کاتەکە زۆر درەنگ بووە.
- گوتی: نێوان و دووری ڕێی بەرەو خودا بە تەمەن ناپێوردرێت" بەڵکو بە کردەوەی چاك و یارمەتی خودا دەبڕدرێت.. پێدەچێت وەڵامی ئامۆژگاریەکەت دابێتەوە و بۆ دەنگی حەقیقەت ملکەچ بوو بیت، ئەمەش بەڵگە و نیشانەیەکی دیار و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی لەسەر ڕێگای حەقی و خێرێکی پەنهانت تێدایە، ئەوەندەت لەسەرە لەگەڵ داردا پەیمان ببەستی و خزمەتی بکەیت بۆ ئەوەی لەبەروبوومە چێژ بەخشەکەی تامبکەی و خوداش پشتیوانیت دەکات. باوەڕم پێبکە کوڕەکەم" هەیە لەسەرەتای ڕۆژدا تەوبە دەکات و بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، شەوی بەسەردا نایەت دەبێتە یەکێ لە

بەندە نزیکەکان و وەلیەکانی خودا، ئەمەش لای خودا زەحمەت نیە و خێریش هەر لای خۆیەتی، هەموو شتێکیش لای ئەو بە ئەندازەیەکی دیاریکراوە.

شێخ داوای ڕێپێدانیدا تا شتێکم وەکوو بەخێرهاتن پێشەش بکات. وام گومان دەبەم شیکاریی ئەو هاوکێشەیەم دۆزیوەتەوەن ئەو هاوکێشەیەی لەدوای مردنی باوکم سەرقاڵیکردووم.. هاوکێشەی ژیان و چێژ بینین و نەمان و مردن.. چۆن لەنێو ئەو هەموو سنوورانە بێ خەوش و خاڵ بژیم! تەنانەت مردن! چۆن بە ڕوویێکی خۆش و دڵێکی فراوان پێشوازی لێ بکەم؟!

کردەوەی چاك و مانەوە لەبەردەم دەرگای خودا... بەڵی بەڕاستی ئەوە دەرمانی ڕاستەقینە و چارەسەر و پەرجووە بۆ ژیانێکی ئارام و بەختەوەر، بەڕاستی هەموو شکۆ و سەربەرزیەك لە گوێڕایەڵی پەروەردگاردایە.

چەندە نەزان بووم! کاتێك وا گومانم دەبرد، بە سووچی ئەوەی مردنمان لە پێشە و هیچ ڕزگاربوونێکمان لێی نیە، هەروەکوو ئارەزوومانە دەبێ چێژ لە ژیان وەربگرین، بەڵام جیهانەکانی مرۆڤ بە نەمانی دونیا کۆتایی نایەت! بەڵکوو بە نەمانی ئەو دەست پێدەکات، ئایا تەمەنی دونیایی (کاتی) بە بەراورد بە ژیانی (نەمریی) دواڕۆژ چەندە، ئایا پشت بە دونیا ببەستین کە شوێنی پەڕینەوەیە و دواڕۆژ پشتگوێخەین کە مەنزڵگای هەمیشەییە، ژیانی هەمیشەیی هەر لەوێیە.

هاتنی شـــێخی خۆپارێز منی لە دەریای بیرکردنەوە دەرێنا، مەجمەیەکی لە دەست بوو کە دوو کوپ چایە و دوو ئاوی لەسەر بوو. بە گوێمدا چرپاندی :

- ببورە کوڕەکەم هەر ئەوە هەبوو.
- گوتم: قوربان دەکرێ داوای شـــتێکی زۆر گرنگت لێ بکەم، زۆر گرنگە، بەڵکو وای دەبینم کە ژیانم بەوەوە بەندە، هەر دەبێ ببێ.
- گوتی: بێگومان ڕۆڵە فەرموو:

گوتم: قوربان، دەمەوێ لەســەر ڕێچـکەی ئێوە بم، ببمە یەکێ لە ئێوە، لە کۆڕی زانست و زیکر و هەژاران و دروێشان دابنیشم. باوەر بکە قوربان دوای ئەوە هیچ چارە سەرێکم نیە جگە لەوەی بە تەواوەتی پشت لە دونیا بکەم، هەروەك چۆن پێشتر ڕووم تێکردبوو.

شـــێخ فەرمووی: بەڵام کوڕەکەم ناتوانیت ئەوە بکەیت، لەوانەیە ئەوە زیانت پێ بگەیەنێت و هیچ ســـوودێ لێ نەبینیت، تۆ ڕێچـــکەی تایبەت بە ژیانی خۆت هەیە و لەســـەری گەورە بوویت. بە هەرحاڵ تۆ دەتوانی ببیتە کەسێکی باش و نزیك لە خودا بێ ئەوەی بێیتە پاڵ هەژاران و دەروێشـــــان. تەریقەت ئەرکێکی ئەوەندە ســانا و ئاســان نیە هەروەکوو گومانی بۆ دەبەیت، پێموایە تۆ ناتوانین

لەسەر چەشتنی ئازارەکانی ئارام بگریت، لەکاتێکدا تۆ هەموو تەمەنت لە خۆشی بەسەر بردووە و خزمەتکراوی.

گوتم: تکات لێدەکەم قوربان! خۆم یەکلاییکردۆتەوە.. باوەڕم پێبکە پاشگەز نابمەوە! ئەوەی پێشوو بەسە، لە شەڕی نەفسم ڕزگارم بکە!

گوتی: لە ماوەی تەنها دوو کاژێر خۆت یەکلاییکردەوە؟! ڕۆڵە ئەمە ئەرکێکی گەورەیە و ئاتاجی بیرکردنەوەی قوڵە. با جارێ لە ئێستادا واز لەوە بێنین، .. ئەمرۆ بە تەنها لەگەڵ خودا دابنیشە، گەر ڕاستگۆیی و یەکلابوونەوەی نەفست بۆ ئەو ئەرکە بەدی کرد" وەرەوە جارێکیتر قسەی لەبارەوە دەکەین، ئەگەرنا ئەوا هەموومان بەندەی خوداین و بە ڕێگای خۆمان بەرەو لای خودا هەنگاو دەنێین.

لەو چاوپێکەوتنەی ئەوجارەم لەگەڵ شێخدا ئەوە ڕووی نەدا کە بۆی هاتبووم. بە هەرحاڵ بڕیارمدا جارێکی تر لە گەڵ خۆمدا دابنیشمەوە و هەڵسەنگاندن بۆ کارەکە بکەم.

ڕەنگە بڕیارەکەم بە ساتی لاوازی مرۆیی بووبێت و ماڵوێرانی و خلیسکانیش لە پەلەکردندایە. گەڕامەوە ماڵەوە و نوێژی خەوتنانم بە تەنها کرد، دانیشتم و بیرم لە ڕۆژانی ڕابروو و داهاتوو دەکردەوە، دڵم کەوتە هێدمە، دواتر بە تەنها لەگەڵ خودا کەوتمە ڕاز و نیاز، لێیدەپاڕامە و داوای ڕێی ڕاست و سەرفرازیم لێ دەکرد، داوام لێ دەکرد دەستم بگرێت.

لەسەر ئەوە یەکلایی بوومەوە کە هەر دەبێ مامۆستا و چاوساغێکم هەبێت، دەبێ ڕێگەی تێکۆشانی لەگەڵ نەفس بگرمەبەر، وەکوو ئەوان ئارام بگرم،

گومانی باشم بە خودا برد کە پێشوازیم لێ دەکا و کەسێکم بۆ رام دەکات تا بەرەو لای خۆیم نزیکم دەکاتەوە.

## (٣)

لە زەویەکی نەرم و قوڕاو ڕامدەکرد، درووستکراوێکی ترسناك لە شێوەی گیاندارێك دوامکەوتبوو، پێشتر هاوشێوەی ئەوم نەدیبوو. من ڕامدەکرد و ئەویش دوامدەکەوت. هیلاکی کردم و هێزی لێ بڕیم، کەمێکم مابوو بگەمە وشکایی و پشوو بدەم و عارەقی ماندوێتی و شەکەتیی بسرم.

پاشان پیاوێك هات کە پێشتر لە ژیانمدا نەمبینی بوو.. مووی ڕیشی چڕ و ڕووخساری سپی ڕەنگ بوو، شکۆی دەروێشی پێوە دیاربوو. لەسەر ڕێگاکەم لێرە و لەوێ خەڵکێکم دەبینی، بەڵام کاتێ ئەو درووستکراوە سەیرە ئەو

دەروێشـەی بینی، سـەری شـۆڕ کرد و ڕووی وەرگێڕاو گەڕایەوە، ئیتر ئاوڕیشـی نەدایەوە و دوورکەوتەوە.

دەروێشەکە سەیرێکی کردم و گوتی: کوڕەکەمان بە خێر هاتی .

لە سەردانی دووەمم بۆ لای شێخ" ئەو خەونەم بۆ گێڕایەوە، بۆم باسکرد کە خۆم بۆ دوارۆژ یەکلایی کردۆتەوە، هەر دەبێ بێمە سەر ئەو ڕێیە.

ئەویش موژدەی دامێ، وتی: خودا کەسـێکت بۆ ڕام دەکات تا بەرەو لای خۆی نزیکت بکاتەوە. پێی وتم: کە دەبێ لە ئێسـتاوە خۆی لەسـەر زۆر سـەلاواتدان ڕابێنیت، ئەوە چارەسـەرە بۆ ئەو حاڵەت و بۆ هەموو نەخۆشـیەك. ئەوەی بە ڕاسـتگۆیی و نیەتپاکی پەیمانی لەگەڵ ببەسـتێ" بێگومان بە یارمەتی پەروەردگار دەگاتە مەبەسـت، پەروەردگاری دەیگەیەنێتە لای ئەو کەسـەی کە پەروەردەی دەکات، یان وای لێ دەکات خۆی ببێتە ئامۆژگاریکاری نەفسـی خۆی، دەتوانێ سەرکۆنەی نەفسی خۆی بکات و لە خراپە قەدەخەی بکات، هەر پەروەردگارە وای لێ دەکات بە دیداری پێغەمبەر ( د.خ) شـادبێت و لەوەوە ڕێنموونی وەردەگرێت، بـە کورتی کـاروبـاری دەکـەوێتـە ژێر فرمـانی خودا و ڕەزامەندی ئەوەوە.

هەروەك چۆن هەواڵی پێدام کە ئەو چیتر ڕێگەپێدراو نیە بۆ پەروەردەکردنی دەروێش و موریدان، بۆیە پێویست دەکات بۆ ئەو گە شتەم داوای پەروەدەکار و مامۆستا و شێخێکی ڕێپێدراو بکەم، بانگی کردم بۆ ئەوەی نموونەی ئەو شێخە و مامۆسـتا ڕێپێدراوانەم نیشـانبدات، ئەویش کەسـێکی گەورە و خواناس و زانا بە شـەریعەت و مەعنەویەت بوو، بە "شـێخ مەهدی" ناسـراوبوو، لە گوندێك

دادەنیشت لە ناوچەی " قوص"، ئەو پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ "شێخ مەهدی هەیە" ڕۆی چوارشەم سەردانێکی ئەو دەکات، داوای لێکردم ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەو بچم، چوون کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەڵ پیاوچاکان هیمەت مرۆڤ بەرز دەکات و لاوازی ناهێڵێت، بۆیە پێویستی دەکرد ئەو هەلە ڕەخساوە بقۆزمەوە.

بەو شێوەیە جەنابی شێخ خواحافیزی کرد و منیش گەڕامەوە ماڵەوە، لە ڕاستیدا پێشتر ناوبانگی ئەو شێخەی کە بە " شێخ مەهدی" ناسراو بوو گوێبیست بووبووم..

خەڵکی تا دوورترین سنوور و فراوان ئەندازە گومانی باشیان پێدەبرد، چەندین قسەیان لێ دەگێڕایەوە- کە نازانم تا چەند ڕاستن- چوون من لە نزیکەوە ئەو پیاوەم نەدیوە و گەواهی ژیانی ئەو نەبووم، باسی دوورەپەرێزی ئەو لە گوناه و یەکلاییبوونەی بۆ خودا و رامکردنی نەفس و قووڵبوونەوەی لە شەریعەت و مەعنەویەت باس و خواسی نێو خەڵکی بوو، هەندێ بە خۆری ڕووناککەرەوە" - ئەو خۆرەی کە ژیانی خەڵکی ڕووناك دەکاتەوە و ڕێچکەی ڕێبواران و موریدان خۆشدەکات- پەسنایان دەکرد.

بەر لەوە بڕوام بەو گێڕانەوانە نەبوو کە خەڵکی لە بارەی شێخ بڵاویاندەکردەوە، ئەو ڕووداوانەی کە لەگەڵ شێخ ڕوویداوە. پیشتر کاتێك لەبارەی ئەو ڕووداوانە قسەم لە گەڵ دەکردن" بەم شێوە یە وەڵامیان دەدامەوە و دە یانگوت: پەروەردگار بە هۆی کۆششەکانی چەند دەرگایەکی زانین و نزیکی لە خۆی بۆ واڵا کردووە، تاریکی و پەردەی دووریشی لابردووە، بەو هۆیەوە بینایی ڕۆشنبۆتەوە، ڕووناکیی بینایش گەر درووست بوو" نادیار دیار دەبێت و پەنهانیش ئاشکرا.

بە درێژایی ئەم شـــەوە بە ئاگایی مامەوە و بیرم لە چـــارەنووســـی خۆم دەکردەوە، تکام لە خودا کرد کارەکەم بۆ ئاسان بکات و بەرچاوم ڕۆشن بکات.

خەیاڵێك بە ئاوەزمدا دەخولایەوە کە بە پێغەمبەر(د.خ) پەیوەســـت بوو، بێگومان کارەکانمان نیشـــانی پێغەمبەر دراوە و ئەویش داوای لێخۆشـــبوونی بۆ کردووم، شەرم دایگرتم، ئەگەر لە ڕۆژی دوایی بە دیداری پێغەمبەر(د.خ) شاد بم چ پێدەڵێم؟ ئەمە ئەفســـووس و داخێکە دوای ئەوە داخ و ئەفســـووســـی لەو شێوەیە نیە. ئەو شـەوەم بە دوعا و پاڕانەوە بردەسـەر. لە ڕێکەوتی دیاریکراوا سەردانی شێخ مەهیدیمان کرد.

سێ کەس بووین. شێخ موعتەسەم و من و گەنجێکیش کە نەمدەناسی، ئەو گەنجە لەگەڵ شێخدا باسی ئەو کۆمەڵە و ڕێبازی تەسەوفیان دەکرد.

ئامۆژگاری کردم کە ڕەوشـــتی قوتابی بەهرە بە دوای خۆی دێنێ، هەر کاتێ مامۆســـتا و شـــێخێکی پەروەردەکارت دۆزیەوە دەبێت خۆتی ڕادەســـت بکەیت و بەڕاســـتگۆیی لەگەڵی بەرەو پەروەردگار هەنگاو بنێیت، ئەم خۆڕادەســـتکردنە لەکاری هەرە لە پێشینەی موریدە، نابێت مورید جگە لەو ڕێنماییانەی شێخەکەی دەیکات خۆی بە شـــتێکی تر خەریك بکات، نابێت پەلەی کردنەوەی دەرگاکانی بەرەو خوداچوون بکات، چوون ئەو خۆی دەرگایەکە لە دەرگاکانی گەیشتن بە پەروەردگار، بۆیە دەبێت بەهای باڵایان بناسین.

بە شێخ موعتەسەمم گوت: قوربان بەڕاستی من سپاسگوزاری تۆم.

- گوتی: شـــایەنی نیە کوڕەکەم، بەڵکوو دوای مردنمان بیرمان بکەیت و نزامان بۆ بکەیت.

- گوتم: قوربان دەسپێکی ناسینی تۆ لەگەڵ ئەو سەردارانە چۆن بوو؟ چۆن ئەوانت ناسی؟ دەبینم چەندین ساڵە ڕێبواری ئەو ڕێگایەیت!

هەر کە ئەوەی لە من بیست چاوانی پڕ بوون لە فرمێسک و لە چاوانیدا دەتکان.

- دواتر گوتی: ڕۆڵە تکام لە خودایە لەسەر ئەو حاڵە بمانمرێنێت، ئەوەمان بەسە و شانازیە کە ئێمە لەبەر دەرگای ئەوین و بە نزیکی ئەو چێژ دەبینین.

شێخ دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی یەکترناسینەکەی و گوتی:

لەسەرەتادا من وەکوو هەر کەسێکی موسڵمان بووم، پەرستشەکانم ئەنجامدەدا و هەوڵم دەدا ڕزقێکی حەلاڵ دەستبخەم و خانەوادەمی پێ بژێنم، ڕۆژەکانم دووبارەبوون و لەسەر یەك شێواز دەڕۆیشتن، ئەمڕۆم وەکو دوێنێ بوو و دوێنێش وەکو ئەمڕۆ. هیچ ڕۆژێك بە خەیاڵمدا نەدەهات ئەو ڕێچکەیە بگرمەبەر، تەنانەت گومانی خراپیشم پێیاندەبرد و پێموابوو ئەوەی ئەوان ئەنجامی دەدەن لە دەرەوەی قورئان و سوونەتە. منیش وەکوو خەڵکی ئەوانم بە لادەر و دەرچوو لە ئایین دەزانی، تومەز من لە ئامانج و مەبەستەکانیان بێخەبەربووم و تێگەیشتنی تەواوم بۆ کار و چالاکیەکانیان نەبوو.

ئەگەرچی لەوەشدا عوزرم هەبوو، چوون بانگەشەکاران زیاتر گرنگیان بە ڕووکار دەدا، لەکاتێکدا سۆفی و موریدە ڕاستگۆکان ئەوانەی شەریعەت و

مەعنەویەتیان لە خۆدا کۆکردبوویەوە" حەزیان بە هێشتنەوەی نهێنی کارەکانیان بوو، لە ناوبانگ و دەرکەوتن دەترسان.

تا ڕۆژێك هات" لە ماڵی یەکێك لە مامەکانم بووم کە لە یەکێك لە گوندەکانی شاری " قەنا" نیشتەجێ بوو. خوانچە ڕاخرا، دانیشتن تا دەست بە نانخواردن بکەین، لەو کەشە دڵگیر و دڵڕفێنەدا ئامۆزاکەم گوتی: کەسێك هەیە بە ناوی : " شێخ عیمران" پەسنی شان و باڵیدا، وەکوو یەکێك لە گەورە دۆستانی خودا ناساندی، ڕووی لە من کرد و گوتی: چی دەڵێیت بە یانی بچینە سەردانی؟

خواردنەکە هەر لەناو دەمم بوو بە گاڵتەوە گوتم: دۆستێك لە دۆستانی خودا! ؟ دۆستانی خودا پێویستیان بە ناساندن نیە و نا ناسرێن، لەوەی تۆ باسی دەکەیت وادەردەکەوێت ئەو کەسە فێلباز و تەڵەکەباز و فێڵبازێکە، لەو سەردەمە لەو جۆرە فێڵبازانە زۆرن.

لەوکاتەدا مامێکم کە تەمەنی پەنجا ساڵێکە و قورئانی پیرۆزی ئەزبەر کردووە، بە دەنگێکی زبر و تێکەڵ بە ناڕەزایی گوتی: نەخێر، وامەڵێ، ئەو پیاوەی باسی دەکرێت لەو جۆرە کەسانە نیە، بەڕاستی ئەو کەسێکی چاکەکارە. دواتر تۆ نایناسیت" چۆن بەو جۆرە باسی دەکەیت و ستەمی لێدەکەیت، کوڕم ویژدانت هەبێت؟

هەستم بە شەرمەزاریەکی زۆر کرد، چوون بەڕاستی هەڵەم کرد. تا شەرمەزاریەکەم دیارنەکەوێت هەڵوێستەکەم گۆڕی و گوتم:

= باشە وەلید بەیانی دوای عەسر دەچین بۆ لای ئینشائەڵلا.

وەلیدی ئامۆزام بە پێکەنینەوە گوتی: ئەگەر نایەیت کێشە نیە.

- گوتم: نەخێر بەڵکوو سبەی پێکەوە دەچین، بە چاوم ئامازەم بۆ کرد کە قسە و باسەکە بگۆڕێت.

بە ناچاری لەگەڵیان چووم، لە قوڵایی ناخمەوە لەسەر ئەو بۆچوونەبووم کە ئەو شێخەش یەکێك بوو لەو فێڵباز و درۆزنانە.

چوومە ژوورەوە و ئەوەی لە قوڵایی ناخم بوو ڕاست دەرچوو...!

ئەوەی دیار و ئاشکرایە کە ئەو خەڵکەی بە دوای چاکسازی و ڕاستگۆییەوە بوون و سینەیان سەلامەت بووە ئەو خەڵکانە بوون کە بە تەواوی پشتیان لە دونیا کردووە، بەڵام ئەوەی من بینیم شتێکی تر بوو، شێخ لە جوانترین جلەکانی پۆشیبوو، حاڵی وا نیشانی دەدا کە یەکێکە لە دەوڵەمەندان و خۆشگوزەرانە! هیچ ئاسەوارێکی لەخۆگرتنەوە و پشت لە دونیاکردنی پێوە دیار نەبوو.

لە کۆڕ و بازنەی ئەواندا دانیشتم، پێشتر بڕیاری پێشوەختەم لەبارەی ئەو پیاوە دابوو، بابەتەکە لەکنە من کۆتایی هاتبوو، هیچ گرنگیم بە قسەکانی نەدەدا، سەیرمدەکرد و نەمدەتوانی هیچ بکەم جگە لە چاوەڕوانی تا کۆتاییهاتنی دانیشتنەکە.

قسەکانی بە دوعاکردن کۆتایی پێهێنا و ئێمەش لە دوایدا ئامینمان بۆی دەکرد، دیدارەکەمان کۆتاییهات و مۆڵەتی ڕۆیشتنمان خواست، ئەویش مۆڵەتی داین، پشتمان تێکرد بۆ ڕۆیشتن" شێخ بانگی کردم و گوتی: کوڕم تۆ وەرە، ئامازەی بۆمن کرد، ئامۆزاکەم ئامازەیەکی بۆ کرد و کە بڕۆمە لای شێخ و وەڵامی بانگەکەی بدەمەوە.

لە بەردەمی خۆی داینیشـــاندم، بەرووмدا بزەیەکی کرد، ئەگەر ئەو بزەیە وەرگێردرابووایە سەر زوبانی کوردی ماناکەی دەبوویە: ( زانیمان باسی چیت کرد)، وتی: ڕۆڵەکەم من پشـــتم لە دونیا نەکردووە و بانگەشـــەی پشـــت لە دونیاکردن و کەمالیش ناکەم، داوا لە خودا دەکەم منتبارمان بکات بەوەی شوێنکەوتەی پێغەمبەر(د.خ) بین، دەمەوێ شتیکت بۆ ڕوون بکەمەوە.. ئەوانەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە کردەوەی دڵن و پەیوەندیان بە ڕووکە شەوە نیە. چەندین کەس هەیە لە کۆشـــکدایە و لە نزیکانی خودایە و بۆ خودا یەکلایی بۆتەوە، چـــەندین هەژاری بێ دەرەتانیش هەیە کە ژەمی ڕۆژانەی دەســـتناکەوێت و لە هەرە دوژمنە سەرسەختەکانی خوداشە.

لە ڕاستیدا سەرم گێژی دەخوارد، لە خەجاڵەتی و سەرسامی ئاشکراکردنی حاڵی پەنهانم نەمدەزانی چـــۆن وەڵامی بدەمەوە.. ئایا بەڕاســـتی چـــیرۆکی دۆستانی خودا لەو سەردەمەدا بۆتە خەیاڵ؟!

شـــێخ و تەمەندارەکان چـــیرۆکی دۆســـتانی خودایان بۆ دەگێڕاینەوە، وامان گومان دەبرد کە خەڵکی ئەو سەردەمە وەکوو خەڵکی سەردەمانی پێشووە، لەو ژیانەی کە مادەگەرایی بەسەریدا زاڵ بووە و هەموو لایەنەکانی بە مادەی دووری ڕەنگرێژ کردووە، ئایا هیچ شـــوێنێك لەســـەر زەوی ماوە بۆ دۆســـتانی خودا؟ دۆســـتانی خودا ڕێگای خودایان ناســـی و بە پلەکانی " صـــدیقی" کە لە دوای پێغەمبەرایەتی بەرزترین پلەیە" بە دەستیان هێنا.

ئەوەی ڕوون و ئاشـــکرایە ئەوەیە کە پەروەردگار پەردەی لادانی نهێنییەکان بۆ هەموو کەسێك لانادات، بەڵکو ئەوە دیارییەکە خودا پێشکەشی دۆستێکی

خۆی دەکات، ئەو دیارییە دەبێتە ڕێز و کەرامەتێک کە پەروەردگار لەسەر دەستی یەکێک لە هەڵبژێردراوانی خودا نیشانی دەدات، لەسەر دەستی یەکێک لەوانەی کە ڕێگای پڕ چەرمەسەریان بڕیوە و لە لێزمەی پڕ لە خۆشەویستی خودا بەهرەمەندبوون.

دکام لێکرد بۆ ئەو خراپ گومان بردنەم لێم ببووری، بەڵام ئەو گوتی: نا کورەکەم ئاساییە، خودا لە هەمووومان ببووری.

لەلای ئەو ڕۆیشتم" بینیم ئامۆزاکەم لە دەرەوە چاوەڕێمە..

لێی پرسیم: جەنابی شێخ چی پێگوتی؟ گوتم: هیچ نەبوو. تەنێ قسەی گشتی بوو لەو وشانەی کە ئامۆژگاری میوانانی پێدەکات بە خۆپارێزی و پارێزگاری لە فەریزەکان.

ئەو شەوە بە تەنها دانیشتم و بیرم لەوە دەردەوە کە لە نێوان من شێخدا ڕوویدا..

ئەقڵم درکی بە ڕووداوەکە نەدەکرد، دامابووم لەوەی ئاخۆ لەو سەردەمەدا کەسانێک هەبن پەنهان بزانن و بەڕاستی زانای خواناس بن!! لەناو خەڵکیدا نەکەسم دیبوو نە کەسیشم دەناسی لەو جۆرانەبن، ئەوەی دەمناسی تەنێ کۆمەڵە کە سێکی سواو بوون بە دونیا و بە ڕاستی ڕۆڵەی دونیا و ئارەزووەکانی بوون.

عەیامەك چاودێری ئەو شێخەم دەکرد، ئەوەی بینیم ڕاست و ڕێکی ئەو بوو لەسەر شەریعەت. دوای ئەو ماوەیە بۆم دەرکەوت کە ئەو شێخە یەکێکە لە دۆستان و نزیکانی خودا. ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە لەلای شوێنکەوتووانی ئەو قوتابخانەیە ئەوەیە کە هیچ پێزانین و ڕێز و گرنگیەك بۆ کارە سەیر و

سـەمەرەكانی هیچ كەسـێك نیە" ئەگەر ئەو كەسـە كارەكەیی و ڕەوشـت و خوەكانی بە تەرازووی شەریعەت نەبێت، پێوەر لای ئەوان بریتییە لە ئەنجامدانی كارە فرمان پێكراوەكان و دووركەوتەنەوە لەو كردەوانەی ڕێگریان لێكراوە.

هەڵی مانەوەم لە شـاری مامم قۆسـتەوەو داوای لێبووردنم لێكرد، داوام لێكرد ڕێگای گرتنە بەری تەریقەتم نیشـان بدات و ڕێم بدات ئەو ڕێیە بگرمە بەر، ڕەزامەندی نواند" ئەگەرچـی ئامۆزاكەم " وەلید" زیاتر لە جارێك هەوڵی لەگەڵ دابوو بۆ ڕازیكردنی" بەڵام ئەو هەموو جارێك ڕەتیدەكردەوە.

لە شاری جەنابی شێخ و لە خزمەتی ئەودا مامەوە تا گەڕایەوە خزمەت خودا و دونیای خەڵەتێنەری جێهێشت و گەڕایەوە ماڵی خۆشبەختی.

لەگەڵ ئەوەی جەنابی شـێخ بە جەسـتە كۆچـیكردووە" بەڵام هەموو كات لە دڵمدا ئامادەیە، ڕوحە پاكەكەی لێم جیانابێتەوە، سپاسی خودا لەسەر بەخششی كۆبوونەوە و بەیككەیشتن.

بۆیە ڕۆڵەكەم دیسانەوە ئامۆژگاریت دەكەم، ئەگەر خودا منەتی بەسەردا كردیت و بە شێخێكی زانا و ڕەبانی گەیشتی بە هەردوو دەستەكانت دەستی پێوەبگرە و زێدەڕۆییش مەكە.

سـوێند بە خودا لەوەدا خێرێكی بێشـومار و فەزلێكی گەورە هەیە. ئایا هیچ بەخشـشـێك گەورەتر هەیە لە بەخشـشـی گرتبەری ڕێی خود!؟ بۆیە بەردەوام شوێنكەوتوانی ئەو ڕێبازە لە ئامۆژگاریەكانیان دەیانگوت: شێخەكەت لەپێشترە بۆت لە باوكت، بۆیە بەردەوام بیكە بینایی چاوت. بە شـوێن نەخشـەكەی ئەودا

برۆ، هەرچـــی پێیدایت وەریبگرە و واز لەوەش بێنە کە لێت قەدەخە دەکات. شـــوێنی بکەوە و گوێرایەڵی بە، پێداگیر بە و تێبکۆشـــە، باش بزانە ئەوەی بە نزیکی دەرگا و بە لە دەرگادان ئالوودە بێت" ڕۆژێك دێت دەرگاکەی بەڕوودا والآ بکرێت، بەیانیش بە نهێنی سپاسی هەموو ئەو خەڵکانە دەکات کە ئەو ڕێگایەیان نیشانداوە.

قســەکانم لەگەڵ شـێخ" موعتەســەم" بەوە کۆتاییهات کە دوعای ئەوەی بۆ کردم کە خودا بۆ هەموو چاکە و خێرێك بمسازێنێ و گیان نەسپێرم تا لە هەموو پەڵەیەك پاك دەبمەوە. ئەو دەمەی گەیشـتینە" قوس" ئەو گوندە بەناوبانگە لە پێشـــوودا ناوەندی بلاوبوونەوەی ئاینی ئیســـلام و وێســـتگەی گرنگی پێدراوی شەوێنکەوتوانی ئەو ڕێبازە بوو، شوێنی پێگەیاندنی چاکان و پەروەردەکاران و زانایان بوو، لە ڕێگاماندا بۆ لای شـــێخ "مەهدی" گەیشـــتین بە کۆمەڵێك لە دۆســـتان و موردانی شـێخ " موعتەســەم" مۆڵەتیان خواســت کە ئەوان بە تەنها لەگەڵ شێخ" مەهدی" قسە بکەن.

لە نێوان ئەوان و جەنابی شـێخدا گفتوگۆیەکی کورت ئەنجامدرا. دوای ئەوە جەنابی شـــێخ هات و داوای لێبووردنی خواســـت، چـــوون ئەو کۆمەڵە خەڵکەی هاتبوونە کنی داوایەکیان کردبوو هەر دەبویە بە دەمیانەوە بچـــووبایە، بۆیە داوای لێکردم کە بە ناوی ئەو" بە تەنها بچـــمە لای شـــێخ " مەهدی" و شـــەرم نەکەم، چوون سەردانیکردنەکە لە بنەڕەتدا بۆ من بوو، هیچ پێویـستی نەدەکرد جەنابی شێخ" موعتەسەم" و ئەو گەنجە و ئەو خەڵکە بێن.

دوای ئەوەی کە شێخ موعتەسەم ناونیشانی" شێخ " مەهدی" پێدام و پێی گوتم: ئەم شوێنەی کە " شێخ مەهدی" لێی نیشتەجێیە زۆر لە شار دوور نیە" دوای ئەوە لەگەڵ گەنجەکە و هاوڕێکانی ڕۆیشتن.

پرسیارم لە یەکێ کرد کە بەوێدا تێپەڕ دەبوو.. ئەرێ چۆن بگەمە ئەو گوندەی کە لە ناونیشانەکەدا ئاماژەی پێکراوە؟

ڕێی نیشاندام و دوای نزیک بیست خولەکێك گەیشتمە گوندەکە...

هەندێ لە خەڵکی ماڵی شێخیان نیشاندام کە دەکەوتە ناوەڕاستی گوندەکە، خانوێکی سادە بوو، ڕووبەری خانووەکەی ( ١٧٥ ) مەتر تێپەڕی نەدەکرد،.. لە کۆتایی خانووەکە تەنها ژوورێك هەبوو بۆ خانەوادەی شـێخ، ناوەڕاسـتی خانووەکە کرابوویە مزگەوت، نوێژی تێدا دەخوێنرا و میوانان لێی دەمانەوە و فێرخوازانی زانسـت وانەکانیان تێدا دەخوێند، جگە لەمە کۆڕی زیکر و خوێندنی قورئانیشی تێدا دەبەسترا.

## ( ٤ )

دەرگای ماڵی شێخ کراوەبوو، موریدان و فێرخوازانی زانست" ژمارەیان زۆر بوو.

بۆ چوونە ژوورەوە هیچ شـەرمێکم نەکرد، چوومە ژوورەوە و پرسیاری جەنابی شێخم کرد و گوتیان: ئەو لەم مزگەوتە بچووکەیە...

چوومە نێو مزگەوتەکە، شێخێکم بینی لە بارەی زانستەوە دەدوا، قوتابیانی دەوریاندابوو. لێرەوە ئەو هێمنیە ڕوویدا کە لەسەرووی ئاستی خەیاڵەوە بوو..!
ئەو شـێخەی کە لەگەڵ قوتابیان دانشـتبوو هەمان ئەو شـێخە بوو کە لەخەودا بینیم و ڕزگاری کردم و پێی گوتم:
( بەخێربێی ڕۆڵە) ! !

ئەو خەونەی کە بینیم وەکو خەونێکی تێکەڵ و بێ مانا بەسـەرمدا گوزەری کرد و هیچ هەڵوەستەیەکم لەسەر نەکرد، چۆن دەکرێ خەیاڵێك ببێتە ڕاستیەکی بەرجەستەبوو، چۆن دەکرێ بە چاوی سەر ببینرێ! !

بە سـەرسـوڕمانەوە دەمڕوانیە شـێخ" مەهدی"، هەسـتێکی سـەیرم بۆ درووسـت بووبوو، مینا شـتێك بەر هەنیەم کەوتبێت و پەردەی بەرچـاومی لادابێت، زانیم ئەو شێخە کارێکی هەیە و ڕەنگە منیش لەگەڵ ئەو کارێکم هەبێت.

باڵای بەلای درێژی دەچوو، مینا خۆر" ڕووناکی لە ڕووخساریدا دەردەچوو. بە شکۆ و ئارام و جوان بوو. سیمای هێمنی دەنواند، وتەکانی سەنگین بوو، دەنگی بەلای نزمیدا دەشکایەوە. تەسبیحێکی لە دەست بوو، بەس خودا دەزانێ چەند بە شکۆ بوو، ڕووخساری نوور و جوانی پەخش دەکرد.

بەردەوام وانەکانی دوای نوێژی بەیانی دەسـتپێدەکرد و پێش نیوەڕۆ کۆتایی دەهات. کاتێ لە دەرگا نزیکبوومەوە" سەیری کردم و ئاماژەی پێکردم دابنیشم، منیش لە دوای ئەوان دانیشتم.

ئەو دەمەی ئەو دیمەنە جوانەم بینی کە تەژی بوو لە نوور و خێر و فەڕ و هۆگری و ئاسـوودەیی و دڵنیایی، خۆم بینیەوە لەگەڵ ئەو کەسـە پیرۆز و

بەڕێزانە، لە دونیایەکی جیا لەو دونیایەی کە ناسیبووم، لەگەڵ خەڵکانێکی جیا لەوانەی لەگەڵیان ژیابووم، دوو هەستی هاودژ لە ناخمدا درووست بووبوو: خەمباریەك لەوەی گوزەری کردبوو، خۆشیەك لەوەی خەریك بوو دەمچەشت لەو ڕێیەی کە ڕێی چاکەخوازان بوو.

جەنابی شێخ مژوڵی ڕاڤەی پەرتووکێکی ئەو ڕێبازە بوو، ناوی" قوت القلوب" بوو، ئەو پەرتووکە ئی "ئەبو تالبی مەککییە"، چەندە کۆپیەکی ئەو پەرتووکەم لای قوتابیانی شێخ بینی.

وا پێدەچوو من لە کۆتایی وانەکە گەشتبم، ئەوەندەی نەبرد شێخ بە دوعاکردن کردن بۆ قوتابیانی کۆتایی بە وانەکان هێنا، دوعای بۆ کردن کە خودا سەرکەوتوویان بکات بۆ کارکردن لەوەی فێری دەبن، خودا بیانپارێزێ لە شەڕ و شۆڕی دیار و پەنهان، دواتر قوتابیان بەوپەڕی ڕەوشت و شکۆوە شوێنەکەیان جێهێشت.

یەکێ لەو ڕەوشتانەی کە تووشی سەرسوڕمانیان کرد ئەوەبوو کاتێ شێخیان جێهێشت پشتیان لە شێخ نەدەکرد، بەڵکوو ڕوویان لە شێخ دەکرد و بۆ دوواوە دەگەڕانەوە، ئەوەش بۆ نواندنی ڕێز بوو بۆ جەنابی مامۆستای فێرکار.

هەستام و لێی نزیکبوومەوە و سلاوم لێی کرد، بە ڕوومدا بزەی نواند و گوتی:" کوڕەکەمان بەخێربێی"

ئەو وشەیەی کە بەردەوام لە گوێچکەمدا دەزرنگێتەوە ! ئەو وشەیە لەودەمەی لە خەوما گوێبیستی بووم، سەرسوڕمانم زیادی کرد و بڕوای بەهێز کردم، بەوەی

که جەنابی شێخ خاوەن پێگەیەکی باڵایە و منیش لە سەر ڕێگەیەکی درووست و پتەوم.

جەنابی شێخ نیگاکانی بە ڕوومدا چڕ کردەوە و گوتی: ڕۆڵە بۆ دەتەوێ بە ڕێی تەسەوفدا بڕۆی؟

گوتم: دەمەوێ بە پەروەردگار بگەم. ئەوە مەبەست و ئامانج و خواستمە، شتێك منی بۆ لای تۆ پەلكێش كردووە" ڕەنگە ئەمە دوعای پیاوچاكێك بێت هاوڕێگەی قەدەری نووسراو بووە.

گوتی: ڕۆڵە ئەمە ماندووبوون و تێكۆشانی ڕوحە، ڕێگەم بە هیچ كەسێك نەداوە ئەو ڕێیە بگرێت، مەگەر دوای ئەوە بوو‌بێت كە بۆم دەركەوتووە شایەنی ئەو ڕێگەیەیە. بەڵام من ڕاستگۆیی و هیمەت بەرزێ و نیەتپاكیم لە تۆ بەدیكرد، بۆیە بە ئیزنی خودا كارێكت پێ دەسپێرین" گەر تیایدا بە ئەمەك بوویت. دواتر ئەوەش بزانە كە كۆڵەكەی ڕێبازەكەمان لەسەر قورئان و سوونەتە، بە ئەندازەی تاڵەموێك لێی لانادەین، جگە لەو دووە بەهیچیتر ڕازی نابین، لە شەوە ئەنگوستەچاودا بە ڕۆشنایی ئەو دووە ڕێدەكەین و لەكاتی تەنگەتاویدا هانای بۆ دەبەین...

لە دەرگادانی یەكێك لە میوانان وتەكانی شێخ پچڕاند، ئیزنی هاتنەژوورەوەی دەخواست، جەنابی شێخ ئیزنیدا، گەنجێك بوو لە شێخ نزیكبوویەوە و بەیەكەوە بە نزمی دەیانچرپاندە گوێی یەكتر، دواتر گەنجەكە ڕۆیی.

دواتر بۆم دەركەوت كە كوڕەكە بۆ وەرگرتنی پەیمان و تەریقەت لە سەر دە ستی شێخ هاتبوو، بەڵام جەنابی شێخ ڕێگری ئەوەبوو، ئەمەش لەبەر پاراستنی زنجیرەی پیرۆزی تەریقەت و نەنا سراوی كە سەكەبوو، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت

که شێخ بینیبێتی له توانای کهسهکه دانیه و ناتوانێ لهسهر ئهو ڕێیه ئارام بگرێت.

چوون ئهو کاره سهرهتاکهی پێویستی به ئارامگریهك ههیه تامهکه تاڵ و ژار ئاسایه و کۆتاییهکهی سوپاسگوزاریی و ههنگوین ئاسا شیرین و پاڵافتهیه.

شێخ له ئاخاوتنی بهردهوام بوو و دهیگوت: وهکوو گوتم ڕۆڵه ئهوه سهرهتای ڕێگایه، بهوهی پێت دهڵێم ویستت بۆ ئهو کاره دهستهبهر دهکهم، نامهیه بۆ " شێخ موعتهسهم" دهنووسم و ڕادهستی ئهوی دهکهی، بۆی دهنووسم که قورئانت پێ ئهزبهر بکات و ههندێك له سوننهت و ڕێنماییهکانت فێر بکات، دوای ئهوه دێیتهوه لام، هاوتا لهگهڵ ئهمه پابهندی زیکری" ئهستهغفیروڵڵا" دهبیت بۆ ئهوهی دڵت پاڵهفته و پاکدهبێتهوه و ئامادهدهبێت بۆ وهرگرتنی ئهوهی پێتدهدرێت. ههوڵ و تێکۆشانتم نیشان بده! ئهگهر ڕاستگۆ بوویت له ههوڵهکانت" ئهوا ئێمهش باوهشت بۆ دهکهینهوه و بهڕاستت دهزانین، ئهگهرنا تۆ زهرهرمهند دهبیت، ئینشائهڵڵا به ڕاستگۆیی دهتبینین.

دهستی جهنابی شێخم ڕاموسی و خوداحافیزیم لێکرد و ئهوێم جێهێشت. دڵخۆشیهکهم بێ ئهندازه بوو، به ههموو گهنجینهی دونیا پێوانه نهدهکرا.. به سینهی گوشاد و ئاسووده و تهژی له خۆشیی و شادی شێخم جێهێشت. ئهو بارگرانیهی چهندین ساڵ بوو له ژێریهوه ئازارم دهچهشت" دامنان و تورِ ههڵمدان..

ئهو پیاوه بۆیه هێز و پشت و پهنام، لهو ژیانه پڕ له ئاسۆریه بهرهو کهناری ڕزگاربوون دهستی گرتم. ئای ئهوه چ دهستکهوتێکه! دۆزینهوهی پیاو چاکێکی

بەهیزی لەو شـێوەیە و بردنەوەیەکە، ئەو پیاوەی بەر لە ئاگاییم لە خەونەکانم پێی ئاشنابووم!.

لەبەری خۆشی بووبووم و لەگەڵ خۆم دەدوام : پێویستە لە ئاستی پەسن و گومانباشی شێخەکەم بم، لە ئاست ئەو بەرپرسیاریێتە بم کە پێم سپێردراوە، بۆ ئەوەی ببمە جێگای ڕەزامەندی و ڕازیبوونی ئەو" پێویسـتە بەردەوام لەسـەر پەیمانەکەم پێداگیربم.

بە دڵخۆشـیی و موژدەی قەبوڵبوون گەڕامەوە زێدی خۆم، دڵنیابووم لەوەی کە جەنابی شـێخ " مەهدی" یەکێکە لەوانەی کە پەروەردگار بە خاتری ئەوان بەرەکەت و فەڕ دادەبزێنێت، یەکێکیشـە لەوانەی کە مەرجەکانی شـێخی پەروەردەکاری ڕاستەقینەی تێدا کۆبۆتەوە.

هەوڵمدا و تێکۆشـام تاوەکوو قورئانی پیرۆز و چـل فەرموودەی پێشـەوا ئەوەوی و چـەند کورتەنامەیەکی "تەسـەوق"م ئەزبەر کرد، ئەمە هەمووی لە ماوەی ساڵێك و سێ مانگ تەواوبوو، شکۆ و گەورەیی بۆ خودا کە یارمەتیدام بۆ ئەم کارە و تیایدا سـەرکەوتووبووم، بەڵێ کلیلی هەموو شـتێك ڕاسـتگۆیی و ئیخلاسـە هەروەکوو گوتوویانە: **" لەبەر دەرگا بوەسـتە و بە ڕاسـتگۆیی دەستپێبکە، بەڕووتدا دەکرێتەوە".**

سـاڵێکی پیرۆز و بە فەڕ بوو.. مژوڵی ئەزبەرکردن و خوێندنەوەی قورئان بووم، شـیرینی ئارامگرتم چـەشـت، بەرهەمەکەی تەواوی قورئانم ئەزبەکرد.. سپاس بۆ خودا... بۆنی هەناسەکانی خۆشەویستیشم لە فەرموودەکانی پێشەوا ئەوەوی دەکرد، گوێچـکەکانیشـم بە بۆنی وتەکانی ڕازاندەوە و چـێژیان وەردەگرت، گشـت وتـەکـانی جوان و بۆنـداربوون، بۆ ئـەزبـەرکردنیـان

ماندوویبوونەکەم بێزارکەر نەبوو، هەرچی نامەکانیشە بە خوێندنەوەیان هەستم بە ئارامی و شکۆ و دامەزراوی دەکرد، کاتێکیش لەگەڵ جەنابی شێخ دەمخوێند تەواوی دڵم ئامادەیی وانەکان دەبوو..

بەڕاستی تەسەوف کرۆکی ئیسلامە و لایەنی کردارەکی مەبەستەکانیەتی، ..

قورئان و سوننەتە، زیکر و خۆشەویستیە، ویرد و ئەرکە، خۆخاڵیکردن و خۆڕازاندنەوەیە[١]..

ئەمە ناوەڕکی شەریعەت و مەبەست و ئامانجە باڵاکەیەتی.

بەو شێوەیە ساڵێك تێپەڕی لە نێوان کارەکەم و چوون بۆ خزمەتی شێخ" موعتەسەم" و سەرقاڵیم بە ویردەکانم.

دوای تەواوکردنی ئەزبەکردنی قورئان" ئاهەنگێکی گەورەم ڕێکخست، بێ ئەوەی کەس بە هۆکاری ڕێخستنی ئاهەنگەکە بزانێ، تیایدا هەرچی هەژار و بێ دەرەتانی لادێکە و لادێکانی دەورووبەر هەبوو بانگران، جگە لەوان زۆرێك لە پیاوچاکانیش بانگرابوون، لەناویاندا" شێخ موعتەسەم" یش بانگکرابوو، ئەوەش

---

[١] خۆ خاڵیکردن: دەستهەڵگرتنە لە هەرچی گوناه و خۆی خراپە. خۆڕازاندنەوە: ئەنجامدانی هەرچی چاکە و ڕەوشتی جوانە.

لەبەر ئەوە بوو کە جەنابی شێخ دەستێکی باڵای لە ژیانم هەبوو.... سپاس بۆ خودا .

بەو شـــێوەیە ئەوەی مامۆســـتاکەم لێمی داوا کرد لە ئەزبەرکردنی قورئانی پیرۆز و سـوننەتی پێغەمبەر(د.خ) هێنامەدی، دوای ئەوە حەزم کرد لە" قوص سـەردانی " شـێخ مەهدی" بکەم، پێشـتر پەیمانم بە خۆمدابوو کە سـەردانی شێخ" مەهدی" نەکەم تا داواکاریەکانی جێبەجێ دەکەم.

لە کاتی نوێژی عەسر گەیشتمە شـارەکە و نوێژی عەسـرم ئەنجامدا، دواتر ڕوومکردە ماڵی" شێخ " کە لە گوندەکە بوو، بینم دەرگاکە کراوەبوو، بەڵام ئەو کەرەتە هیچ قوتابیەکی لێ نەبوو، بەڵکوو چـەند شـێخێکی لێ بوو، دوای ئەوەی ڕووخستەم خواست و چوومە ژوورەوە، ئەوکات خەریکی نانخواردن بوون، سڵاوم لێکردن و وەڵامی ســـڵاویان گێڕایەوە، بەڵام جەنابی شـێخ لە یەکەم بینین زۆر گرنگی بە هاتنەکەم نەدا، لە ئاست چاوەڕوانی من نەبوو، وام بە خەیاڵدا هات کە شتێك ڕوویداوە و شێخ بە هۆیەوە لێم عێجزە.

بەڵام هەرزوو شێخ بانگیکردم بۆ نانخواردن لەگەڵیان هاوبەشی بکەم، منیش گوێڕایەڵیم کرد و دانیشتم، بە گوێرەی ئەوەی دوایین کەس بوو دانیشتم" دوایین کەسیش بوو لە نانخواردن بوومەوە.

بۆ دەست شوشتن هەستام، تەشتێکی گەورە دانرابوو بۆ خەڵکەکە، میوانەکان لە دەست شوشتن بووبوونەوە و پاشماوەی ئاوەکە لە تەشتەکە جێمابوو.

لەو دەمەی دەستم دەشوشت شێخ هاتەلام و گوتی:

- حاڵت چۆنە ڕۆڵە ؟

- گوتم: سپاس بۆ خودا باشم قوربان.
- شێخ وتی: نزمبەوە و لەو ئاوە بخۆرەوە!
- گوتم: چی قوربان؟
- گوتی: هەروەکوو بیستت.

هەموویان دایانڕوانیە من، چوون بە دەنگی بەرزەوە ئەمەی گوت، میوانەکانیش پێنج کەس بوون و تەمەنیان هەڵکشا و بە ساڵاچووبوون.

وتەی شێخ " موعتەسەم"م بیرکەوتەوە کە ئامۆژگاری کردم بەوەی گوێڕایەڵی فرمانەکانی شێخ بکەم و لە فرمانی دەرنە چم، چوون بۆ سپاردنی هەرکارێکیان حیکمەت و هۆکارێك هەیە، هیچ دەرەتانێکم نەبوو جگە لەوەی بکەومە سەر ئەژنۆ و هەروەکوو فرمانی پێکردبووم لە ئاوەکە بخۆمەوە.

شێخ زوو بە فریام گەیشت و لە هەنیەی نیشانەی ڕزامەندی دیاربوو و گوتی: بەسە.. بەسە.. هەستە، دەستی لەسەر شانمدانا و گوتی: تا تەواو دەبم لە ناو مزگەوت چاوەڕێم بکە، دێمە لات، وەك فرمانی پێکردم چوومە مزگەوت.

وەك دیاربوو ئەو پێنج کەسە پشکی گەورەیان لە زانست و تەریقەت هەبوو، گوێم لێبوو بە شێوەیەك دەدوان لێیان تێنەدەگەیشتم: دەیانگوت: مردنی خوازراو، نەفس... مردن بۆ جەستە .. دۆڕان بۆ نەفس!! بەو جۆرە لەگەڵ خۆم دەدوام، لە کاتێکدا لەناو مزگەوت چاوەڕوانی شێخ بووم.

لە کۆتاییدا دانیشتنی میوانەکان کۆتاییهات و شێخ هاتەلام، لێرەوە" لەودەمەی دەستمنایە ناو دەستی و تەریقەتم لێوەرگرت چیرۆکی من لەگەڵ "شێخ مەهدی" دەستی پێکرد، بەڵێن و پەیمانی چەند کارێکی چاکەم لە کاریوباری دین و دونیا

پێدا، بەو شێوەیە ڕوحم پەیوەست بوو بە ڕوحی مەردانی تەریقەت و بووم بە یەکێك لەوان... هەروەکوو یەکێك لەوان گوتی: پەیوەستی ڕوحت بە شێخەکەتەوە و ڕوحی شێخەکەت بە شێخەکەی خۆیەوە ... بەو شێوەیە مینا زنجیرەیەکی نورینە، یەکێکیتر لە پەسنی ئەو زنجیرە پیرۆزە گوتی:

ئەمان پەتی گەیشتنن، ئەگەر کۆتایی پەتەکە بجوڵێنیت*** سەرەتاکەی لەگەڵی دێتە هەژان.

دواتر پەیمانم بە شێخدا کە تەوبە و پەیشمانی لە هەموو گوناهە بچووك و گەورە دەربېڕم. بۆیە ڕێکردن بۆلای پەروەدگار درووست نابێت، مەگەر واز لە گوناهە گەورە و بچووکەکان بێنیت، پاشان کاخەزێکی پێدام کە ناوی تەواوی زنجیرەی پیاوانی تەریقەتی تێدابوو و گوتی: لە مەودوا ئەمە سەرجەلەی ڕاستەقینەی تۆیە، ئەمانە باوانی تۆن، بە کاری نابەجێ و گوناه شەمەزاریان نەکەیت، بەردەوام یادیان بکە بۆ ئەوەی بەردەوام هیمەت بەرز و ڕوحت بالآبێت.

شێخ بەردەوام زوو زوو ئاراستەی هەندێك کاری گرنگی دەکردم و منیش ئەنجامم دەدا، ئەمەی بۆ ئەوە بوو هەندیدەمێ بەرهەمی تێکۆشانەکەم ببینم، لەسەرەتادا فرمانی پێکردم زۆر پەیوەستی " ئیستغفار" بم، زۆر پێداگیری لەو داوایەی دەکرد، چوون بە هۆیەوە دڵ پاك دەبێتەوە لە هەموو ئەو پەڵانەی پێیەوە نووساون، بۆ سڕینەوە و لابردنی پەردەی بێئاگایی و دووری بوو.

جا بەڕاستی زوو شوێنەواری ئەوەم لەسەر خۆم بەدیکرد، دواتر فرمانی پێکردم بۆ ماوەیەك پەیوە ستی صەلآواتدان بم بە سەر گیانی پێغەمبەر(د.خ)بم، چوون ئەوە دەبێتە هۆی ڕۆشنکردنەوەی دڵ و بەرزکردنەوەی پلە و بەرەو بالآیی بەرزی دەکاتەوە و ژیان خۆش و بوندار دەکات، هەروەکوو چۆن کاریگەری

و شـــوێنەوار بەســـەر دڵی بانگخواز جێدێڵێت و دڵەکەی بەردەوام بە زیندووی دەهێڵێتەوە، بۆیە گوتویانە: " سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر' (د.خ) وەکوو شێخ وایە بۆ ئەو کەسەی شێخ و ڕێنماییکاری نیە".

زۆر دەچوومە لای شێخ و بە گوێرەی پێکران ئامادەی وانەکان دەبووم.

ڕۆژێك لە مزگەوت هاتەلام و دوای ســـڵاو گوتی: ڕۆڵە لەوانەی پێشـــەخۆمان پێمانگەیشـــتووە کە هەندێ کات هەیە گەر مرۆڤ بیانقۆزێتەوە و ســـوودیان لێوەربگریت" بێگومان ئەو کاتانە دەبنە دەبنە پاڵنەری بەهێز بۆ گێڕانەوە و قەرەبووکردنەوەی ئەو تەمەنەی لەدە ستچووە، بێگومان ئەوە بە یارمەتی خودا دەبێت.

گوتم: ئەو کاتانە کامانەن؟

گوتی: پێش بەیانی بە چارەکە کاژێرێك، دوای بەیانیش ئەگەر بە چارەکێکیش بێت، هەروەها پێش ڕۆژئاوابوون، پێویستە لەسەرت ئاگاداری بیت و بیقۆزیتەوە بەو زیکرانەی کە لە پەرتووکی سوننەتەکانەوە هاتووە.

هەروەها لەو هۆکارانەی کە کاتی بە سەرچووت بۆ دەگەڕێنێتەوە و یارمەتیت دەدات پەیوەســـتبوونە بەم دوعا و پاڕانەوانەی کە لە پەرتووکانی ســـوننەتدا هاتووە وەکوو فەرمایشـــتی پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموووێ: ( دوو وشـــەی ســـانا لەسەر زوبان و قورس لەسەر تەرازووی کردەوەکان هەیە بریتین لە: (سبحان الله بحمده سبحان الله العظيم)..

بەم شـــێوەیە لەگەڵ جەنابی شـــێخ هەنگاوەکانم بە ئارامیی و دامەزراویی دەنا، شێخیش دەستی گرتبووم و بۆ کەناری ڕزگاری ڕێنوێنی دەکردم.

لەسەرەتادا ڕۆژانە لە دێکەمەوە بۆ ئەو شوێنەی شێخ لێی نیشتەجێ بوو هاتووچۆم دەکرد، دیدارم لەگەڵ جەنابی شێخ ئازار و ماندووبوونی هاتووچۆی بیر بردبوومەوە، تەنێ بینی ئەو بەس بوو بۆ هەڵگرتنی هەموو ئەو ناخۆشیانەی دێنەڕێ، لەگەڵ ئەوەش پەیمان و ڕێکەوتنم لەگەڵ یەکێك لە ناسیاوانم کردبوو کە کاروباری بازرگانی و جوتیاری لەبڕی من ئەنجام بدات، خۆشم مانگێ جارێك سەرپەرشتی کارەکان بکەم و مانگانەیەکیشم بۆی بڕیبوویەوە. بۆ خۆشم خانوێکم لای ماڵی شێخ کڕی، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا هەموو کات لە شێخ نزیك بم.

پەیوەستبوونم بە شێخ زیاتر بوو، ڕۆژی تەواو وەکوو فێرخواز و شاگرد لە خزمەت ئەو بووم، پەیوەستی وانە و ئامۆژگاریکانی بووم، یەکێ لەو ڕستانەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە ئەوە بوو کە دەیفەرموو: بناخەی تەریقەت لەسەر چوار کۆڵەگە وەستاوە: برسێتی، بێدەنگی، کەمخەوی، دورەپەرێزی.

پێویست بوو لەسەرم لەگەڵ خۆم بکەومە تێکۆشان تا بەو کۆڵەگانە خۆم برازێنمەوە. فرمانی پێکردم مانگێك لە ماڵەوە بمێنمەوە و لە خەڵکی دوورە پەرێزیم، بۆ ئەو مە بەستە ویردە کانی ئەو ماوە یە و بڕی خواردن و خوارد نەوەی بۆ د یاریکردم و دەربارەی گرنگی ڕۆژووگرتن لە شەریعەت و پاداشتەکەی ئاخەفت، باسی ئەوەشی کرد ڕۆژووگرتن ڕوحی مورید پاڵەفتە و باڵا دەکات.

خۆم بۆ ئەو فرمانەی شێخ ئامادەکرد بە دڵتەنگیەوە، دلتەنگیەکەم ئی زەحمەتی تێکۆشان نەبوو! بەڵکوو ئی ئەوەبوو مانگێك دەمێنمەوە لەماڵ بێ ئەوەی شێخ

ببینم، ئەو ماوەیە ناتوانم ئەو کەسە ببینم کە پێیەوە پەیوەست و گرێدراوم، چ پەیوەستبوونێکی توند و پتەو!.

مانگێك لە ماڵەوە مامەوە، بۆ نوێژی هەینی و نوێژی بە کۆمەڵ نەبێت نەدەچـــوومە دەرەوە، بە ڕۆژ مژوڵی خوێندنەوەی قورئان و ڕۆژووگرتن بووم، شەوانیش بیرکردنەوە و زیکردن، ئەمەش لەسەر داوای جەنابی شێخ بوو هەر لەو ڕۆژەی کە پەیمانم پێیدا.

لە شەوی پێنجەمی گۆشەگیریەکەم" جەنابی شێخم لە خەو بینی و گوتی: لێم ببورە ڕۆڵە، شــەیتان بیری بردمەوە پێت بڵێم: ئەمان.. ئەمان نەکەی لە کاتی گۆشـــەگیریەکەت خۆت لە ئەوانیتر بە باڵاتر و باشـــتر بزانی، بە خەیاڵت نێت و نەڵێیت بوومەتە بەندەیەکی نزیکی خودا و خەڵکی تریش گومرا و سـەرگەردانن، بەڵکو گۆشـــەگیربە بە نیەتی ئەوەی خەڵکی لە شـــەڕت و زیانت پارێزراوبن، وا تێنەگەیت ئەمە بۆ ئەوەیە تا لە شەڕی ئەمان پارێزراوبیَ، گەر کە سێکی لە خۆت بە تەمەنترت بینی بڵێ ئەوە لە ئیسلامەتیدا پێش من کەوتووە، گەر کەسێکی لە خۆت گەنجترت بینی بڵێ: من بۆ گوناه پێش ئەو کەوتووم، نەفســـت ریســوا و ملکەچ بکە، چوون نەفس ڕێگری گەیشتنە).

لەخەوەکەم ڕابووم، لە تەواوی ڕێنماییەکان گەیشتم...

بێگومان شێخی پەروەردەکار ڕێنموونیکار و ڕزگارکارە لە بیابانی گومرایی و لەناوچوون. ئەو ئاسایشە و دژی دز و ڕێگرانە، ئاوێکی پاڵەفتەیە و بڵێسەی ئاگر خامۆش دەکات، بۆ ڕوح مینا باوکێکە پەروەردە و چـــاودێری دەکات بەرەو

باڵایی پلەکانی کەمال، پلەوپایە و پێگەی شێخ لای ڕێبوارانی تەسەوف بەرزترە لە باوك.

یەکێکی تر لەو خاڵانەی کە پەیمانەکەی لەســەر بونیادنرابوو بریتیی بوو لە ئامادەیی شـێخ لە خەیاڵدا بە تایبەت لە کاتی زیکرکردن، ئەمەش بۆ ئەوەبوو لە ڕێکردنمان بۆ لای پەروەردگار هاوڕێی یەکتربین و خەیاڵم بۆ شـتێکی دونیایی نەچـێت، بەردەوام ئەوەم ئەنجامدەدا، هەر بەڕاسـتی هاوڕێم بوو لە ڕێکردنم بۆ لای پەروەردگار.

مانگەکە کۆتاییهات، لەبەرهەمەکانی ئەو دورەپەرێزیی و خۆیەکلاییکردنەوە بۆ پەرســتش ئەوەبوو کە پەروەرگار بینایی فراوان کردم و کرانەوەیەکی گەورەم پێبەخشرا. ئەوەندەم لە بەرووبوومە بۆندار و پاکەکەی چەشـت بە وەسـفکردن ناکرێت، مینا چێژی شیرینی و مەرگەمووشی تاڵایی" بە تامکردن نەبێت لەزەتی نازانی و تا دەردەست نەبێت هەستی پێناکرێت.

بەم شـێوەیە بۆ ماوەی پازدە سـاڵ بەو حاڵە لەگەڵ شـێخ مامەوە، تا دەهات بڕوام زیادی دەکرد و خۆشـەویسـتیم بەرەو ترۆپك هەنگاوی دەنا و دڵنیایی و خۆپارێزی و زوهدم زیادی دەکرد... جەنابی شـێخ دەسـتی گرتم و پلیکانەی وەسڵی بۆ جێگیر کردم، فێریکردم چۆن بەرەو باڵایی بچم، پازدە ساڵ لە نوور و

فەڕ و بەرەکەت" پێمخۆشبوو بەردەوام هەندێ لەم بەخشش و ڕووداوانەی بەسەرمدا دەهاتن بۆ شێخی بگێرمەوە.

گەورەترین سوودم لەم ماوەیە درێژەیە بریتیی بووە لەوەی لەگەڵ شێخ ژیاوم و چاودێریی و جوڵە و دانیشتنەکانی بووم. کاتێك لەکنی دادەنیشتم هەستم بەو ڕەحمەت و فەڕە دەکرد کە بە هۆی مەردان و چاکەکارانی هاوشێوەی ئەو دادەبەزی.

شەریعەت و حەقیقەتم لە کانیاوی شێخ نۆشکرد و پشکی گەورەم لە زانستەکانی تەسەوف و ئاداب و مەبەستەکانی" شەرع و کۆڵەگەکانی، فەرموودە و زانستەکانی فەرموودە، زانستی گەردوون و هەندێك دیوانی شاعیرە سۆفیە دڵگەرمەکانم پێبڕا.

جارێك وەکوو هەمووجار نیازم وابوو لە کۆتایی مانگ سەردانی شارەکەی خۆم بکەم، بەڵام سەیر بوو! یەکەمجاربوو جەنابی شێخ ڕێگری سەرانیکردن بکات و بڵێت: مەچوو و پێداگیریشی لەسەر بکات!.

گوێڕایەڵی فرمانەکەم کرد و نەچووم، پاشان زانیم کە ئەم شەمەندەفەرەی کە بڕیار وابوو لەگەڵی گەشتەکەم بکەم" تووشی ڕووداوێکی نەخوازراو بووبوو،

سپاسی خودام کرد لەسەر ئەوەی ڕزگاری کردم لەو ڕووداوە، لەبەرخۆمەوە دەمگوت: ( ئەمە کەڕاماتێکە لە کەڕامەتەکانی جەنابی شێخ)

هەروەها جارێکیتر یەکێك لە هاوڕێیانم بۆ ژەمی ئێوارە داوەتی کردم و کاتێکمان دیاریکرد بۆ ناخواردن، شەوداهات و پێداگیربووم لەسەر چوونم بۆ داوەتیەکە، ڕێکەوتنەکە ڕۆژی دواتر بوو، شەو جەنابی شێخم لەخەودا بینی، زۆر پێداگیری دەکرد لەسەر ئەوەی نەچمە داوەتیەکە! منیش داولی لێبووردنم لە هلوڕێکەم کرد و نەچوومە داوەتیەکە. دواتر بۆ دەرکەوت کە ئەو هاوڕێیەم ماڵ و سامانەکەی لە حەڕام پەیا دەکرد و ناوبانگی لە لادێ زڕابوو.

جارێك جەنابی شێخ ڕێگەیدام هەندێ لە پەرتووکانی تەسەوف بخوێنم، بە بەرەکەتی ئەو دەرگای زانستی ڕەفتارم بەڕوودا والآکرا. تەنانەت لای ئەو پێگەی خۆشم دۆزیەوە. جارێکیان هەندێك لە فێرخوازان هاتنە لای شێخ بۆ خوێندنی هەندێك پەرتووکی تەسەوف بە ڕاڤەوە، بەلأم شێخ فەرمووی: بڕۆنە لای " شێخ ئەحمەد" ئێمە هەموو شتێکمان لەبارەی ئەو زانستە پێبەخشیوە.

بەو شێوەیە لەگەڵ شێخی پەروەردەکار بووم.. بە شێوەیەکی توند و تۆڵ پێیەوە پەیوەست بووم هیچ شتێك ئەو پەیوەندیەی کرچ و کاڵ نەدەکرد.. خۆشحاڵ دەبووم گەر شێخەکەم نووسینێکی ئامادە بکردایە و منیش ڕاڤە و شیکردنەوەم بۆی کردبوایە و نهێنیی و وردبینی و سوودەکانیم بخستبایەڕوو.

(٥)

ڕۆژێکیان جەنابی شێخ لێی پرسیم: بۆچی تا ئێستا ژنم نەهێناوە؟ خۆ ئێستا ژیانم جێگیرە، بەتایبەت ژمارەیەك لە نزیکانم هاوسەرگیریان کردووە، تەنانەت بەشێکیان منداڵیشیان هەیە.

ئەوەم وەك فەرمانێکی شێخ هەژمارکرد، گەڕامەوە لادێکەم بۆ ئەوەی یەکێك لە خزمانم بخوازم، داوای دەستی چەند کچێکم، هیچ یەکیکیان ڕازی نەبوون، بەبیانووی ئەوەی من بۆ هاوسەرگیری ناشێم، من وەك جاران نەماوم! دەیانگوت: تۆ ئێستا دەروێش و سۆفی! سەری زوبان و بنی زوبانت باسی زوهد و پەرستشە، بێگومان سروشتی زۆربەی ئافرەتان لەگەڵ ئەو جۆرە کارانە نایەتەوە، کێ هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێك دەکات کە خۆشیەکانی ژیانی لە خۆی قەدەخە دەکات! ئەوان بەو شێوەیە بیردەکەنەوە..

زۆر لە سەر ئەم بابەت نەڕۆیشتم و پێداگیریم نەکرد، بەڵکوو گەڕامەوە لای شێخ و هەموو ئەوەی ڕوویدا بۆم باسکرد.

جەنابی شێخ فەرمووی: بەڕاستی ڕۆڵە پێشنیارێك دەخەمەڕوو کە پێشتر دواخست بۆ کاتی خۆی، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە و هەر دەبێ بۆتی باس بکەم و تۆش مافی هەڵبژاردنت هەیە.

گوتم: ئەو پێشنیارە چیە قوربان؟

گوتی: ئەگەر بتەوێت کچەکەمت لێ مارە دەکەم.. من پێشنیاری خواستنی کچە تاقانەکەمت بۆ دەکەم، تۆش ئازادی بڕیاردانت هەیە.

پێشتر نەمدەزانی شێخ کچێکی هەیە و بۆ هاوسەرگیری بشێت خۆ ئەگەر بمزانیبا خۆم دەسپێشخەری خواستنیم دەکرد.

گوتم: بە خودا قوربان ئەوە بەخششێکە لە تۆوە، تۆ منت نغرۆی گەورەیی و چاکە کرد.. نووشتامە و دەستی شێخم ماچکرد، دڵخۆش و سپاسگوزاری چاکەکەی بووم.

لەو ساتەوە بیرم لە هاوسەری داهاتووم و چۆنیەتی دڵخۆشکردن و بەختەوەرکردنی دەکردەوە. بۆ چی ڕازی نەبم کاتێ ئەو کچە تاقانەی ئەو شێخەیە کە بە سۆزی دڵنەوایی کردم و بە چاکەکانی نغرۆی کردم.

ئەوەبوو پەروەردگار منەتی بەسەر کردم و لە شەوێکی پیرۆزدا کچی شێخی کردە هاوسەرم، شەوێك پڕاوپڕ لە بەخشش و فەڕ، ماڵباتەکەم بۆ لانێی جەنابی شێخ و ڕێوڕەسمی هاوسەرگیری داوەت کرد، شێخ دوعای پیرۆزی و فەڕی بۆ کردووین و "سومەیە" بوو بە هاوسەرم.

لە شەوی گواستەوەکەدا جەنابی شێخ وەسیەتی کردم هەروەکو چۆن هەموانی وەسەت دەکرد، بە خۆپارێزی لە تاوان بە ئاشکرا و نەهێنی و دەیگوت: دەست بەم پەیمانەوە بگرن و منداڵەکانتانی لەسەر پەروەردە بکەن.

من و هاوسەرم"سومەیە" لە ماڵی شێخ نیشتەجێ بووین، ئەو جگە لەو کچە هیچ منداڵێکی تری نەبوو، حەزی دەکرد لای ئەو بژین و بە تەنها جێیی نەهێڵین.

سومەیە کچێکی زۆر شەرمن بوو.. ڕووخساری بازنەیی و سپیەکی بێخەوش بوو،.. دووچاوی لە بێ ئەندازە جوان و باڵایەکی ڕێکی هەبوو، .. بزە و خەندەیەکی هەبوو لە لێوانی جیانەدەبوویەوە، گەورەترین خاڵی جیاوازیی و ناسینەوەی پاکیی و بێگەردیەکەی بوو.

زۆر تێکەڵی دونیای خەڵکی نەبووبوو. مینا ئەوەی لە بەهەشت لە دایك بووبێ و بە بەرووبوومی ئەوێ نەشوونمای کردووە و دواتر بۆ ئەوە هاتۆتە دونیا تا دونیا بڕازێنێتەوە. بەردەوام پاك و گەشاوەو بێ خەوش بوو .. دونیاکەی منی بە ڕەنگەکانی بەختەوەری ڕەنگڕێژ کرد و خاسێتە جوانەکانی بەسەردا ڕشتم و بوویە دونیاکەی من.

سومەیە باسی ژیانی خۆیی و دایبابی بۆ کردم، پێشتر ژیانیان چۆن بووە. زۆر شانازی بە دایکی دەکرد و ئەگەر باسی کردبا پەسنی دەدا، بە ئەندازەیەك بە هۆی پەسنی کچەکەی دایکەکەیم خۆشدەویست .

باسی زۆرێك لەو ناسۆریانەی دەکرد کە خۆی و دایبابی لەسەرەتای ژیانیان چەشتوویانە. سومەیە تەنها سێ ساڵ لە من بچووکتر بوو، جەنابی شێخ زۆر بە جوانی پەروەردەی کردبوو، کچێك بوو زۆر بە ڕۆژوو دەبوو، زۆر شەونوێژی دەکرد و دوورە گوناه بوو، زانستی زۆر خۆشدەویست.

هەر چۆنێك بێت ژیانێکی خۆش و ئارامم هەبوو کە شێخ و کچەکەی پێیانبەخشی بووم، .. هاوسەر و خۆر و ڕووناکی ژیانم.. چ ئاسوودەیەکی جوانە لە ژێر سایەی خێزانێکی نموونەی خێزانم، چ بەخششێکە ئەوەی منی تێدا دەژیم،.. ئەمە ژیانی من بوو لە ماڵی شێخ بە هێمنی و ئارامی دەمانگوزەراند.

ڕۆژێکیان جەنابی شێخ فرمانی پێکردم مزگەوتەکە فراوان بکەم و لە تەکیشی ژوورێکی بچووکیشی بۆ درووست بکەم، داواشی کرد کە ژوورەکە بچووك و تەسك بێت، تاوەکوو هەر کاتێك چوویە ناوی تەنهایی گۆڕ و ترسەکەی بیر بخاتەوە.

گڵۆپی ژوورەکە بە درێژایی شەو دایسابوو، هەندێ شەو بە ئەنقەست لە

ژوورەکەم دەردەچووم بە نیازی ئەوەی کە ژوورەکەی شێخ نزیك بمەوە گوێم

لە هەندێك لە زیکرەکانی ئەوبێت ، بۆ ئەوەی هاوشێوەی ئەوم لێببێت و

چاولێکەری بکەم.

جارێك گوێم لە نالەیەکی بە سۆ بوو لە سینگێکی سوتاوەوە مینا لەگەنێکی سەر

ئاگر گولپەی دەهات، دەمێك گوێبیستی دەنگی تەسبیحەکەی دەبووم کە بە

شێوەیەکی ڕێکخراو و ڕێکوپێك دەردەچوون، دواتر بە سەرسامی دەگەڕامەوە

تاوەکوو ڕۆژێك هات و جەنابی شێخ بانگی کردم ئەودەمە شەو پەچەی ڕەشی

بەسەر گەردوون دادابوو و ئارامیش باڵی کێشابوو، لە خۆی نزیکی کردمەوە و لە

بەردەم خۆی دامنیشاندم هەروەکوو چۆن باوکێکی بە سۆز منداڵەکەی

دادەنیشێنێت و وەکو ئەوەی ماڵئاوایی بکات ئامۆژگاری کردم.

گوتی: ڕۆڵە گوێبگرە بۆ ئەو وشانەی پێتی دەڵێم: تۆ پێگەی خۆت لای من هەیە

و دەزانی چەندم خۆشدەوێی ..

گوتم: فەرموو باوکە، چی دەفەرمووی شیخم.. فرمان بکە و گوێڕایەڵ دەبم.

گوتی: بزانە ڕۆڵە نەمری مەحاڵە و هەرچەند تەمەنمان درێژبێت هەر دەمرین. من

هەست دەکەم کە ئۆغرم نزیك بووە و جیابونەوە نزیکە و کفن چنراوە و گۆڕ

چاوەنوارە، گوێ لەم گفتانەم بگرە لەوانەیە لە توانامدا نەمێنێ بۆتی دووبارە

بکەمەوە...

تۆم دیاری کردووە بۆ ئەوەی شوێنم بگریتەوە و لە دوای من کاروبارەکان بەڕێوە

ببەیت و ببیتە یەکێ لە پیاوانی زنجیرەی پیرۆزی نورانی، ئەو کارە ناپچڕێت و

سوودەکەشی بەردەوام دەبێت تا خۆر و مانگ مابن.

ڕۆڵە پێشتر ڕێگەمدایت پەروەردە و ڕێنموونی بکەیت، جا بەیداخەکە هەڵبگرە... بەیداخی نور و ڕۆشــنایی و هیدایەت.. پارێزگاری پەیمانەکەت بکە و ڕژدبە لەسەری، ئەو پەیمانە لەگەڵ کەس مەبەستە مەگەر کەسە شایستەی ئەو پەیمانە بێت، چوون ئەو ئەرکە سپاردەیە.

وە سیەتت دەکەم بە ترسان لە خودا و شوێنکەوتنی شەریعەت، هەروەك چۆن وەســیەتم کردووی بە پابەندبوون بە زنجیرەی پیرۆزی نوور، ئامان نەکەی عەیبداری بکەیت، چــوون ئـەو زنجیرەیە بـەیـەکگـەیـەنـەری ڕوحـەکـانـە. بەیەکگەیشـتنی خۆشــەویســتانە، بەیەکگەیشــتنی نەوەکانە بە باپیرانیان، بەیەکبەســتنەوەی زیندووان و مردوانە.. ئەمە بەخشــش و فەزڵێکی گەورەیە و خێرێکی نەبڕاوەیە، خودات لەگەڵە و پشتیوانتە و بەخششەکانی خۆیت بەسەردا دەبارێنێ و سەرتدەخات.

دەربارەی کچـەکەم هیچ وەسیەتێکت ناکەم، چۆنی لەگەڵی هەروا بمێنەوە، تۆ باشـترین هاوسـەر و سـەرپەرشتیاری ئەوی، بێگومان ڕۆژە سـەختەکان ژیری و ئامادەیی و ئەقڵێکی پێگەیشـتوی پێبەخشـیوە، گەر تووشــی گرفتێك یان ناخۆشیەك بوویت ڕاوێژی پێ بکە، لە ڕاوێژپێکردنی زەرەرمەند نابیت.

دواتر جەنابیی شـێخ دەسـتی گرتم و گوتی: (( خودایە جێگیر و سـەرکەوتووی بکەیت، بە یارمەتی خۆت یارمەتی بدە و بە چاودێری خۆت بیپارێزە، بێ ئەوەی لەسـنوور دەرچـێن و لێمانبگۆڕێت لە فیردەوسـدا لەگەڵیدا کۆمابکەیتەوە" ئەی خودای جیهانیان))

دواتر ئەو تەسبیحەی لە دەستی کەوتبووە سەر زەوی هەڵیگرتەوە و پێی گوتم: پێستا بگەڕێوە منیش کارێکم هەیە دەبێ ئەنجامی بدەم.
هەستم بە گەروو گیران و ئازارێك کرد کە توند دڵی دەگوشیم، چاوانم ڕۆندکی گەرمیان دەباراند، چوون جەنابی شێخ بۆ من خۆری هیدایەتە، خۆشەویستیەکەی تێکەڵی خوێن و گۆشتم بووە و هیچ کات بیری ئەوەم نەکردۆتەوە لێیجودا ببمەوە، ئەمە چۆن ڕوودەدات؟
لەلای ئەو هاتمەدەرەوە و قاچەکانم هەڵیاننەدەگرتم، سەدای وشەکانی دڵی وردوخاش کردم، کۆڵەگەی هێزمی داروخاند، مینا هەڵوەرینی گەڵای وشکی درەختێکی بەردەم ڕەشەبایەکی تووش لە پایزی تەمەنیدا..
ژیان بەرەو تیاچوونە..بەڵی، بەڵام بۆ ماوەیەکی تریش بە شێخەکەمان دڵخۆشمان ناکەیت ... بێگومان ڕۆژە خۆشەکان وەکوو بروسکە تێپەڕ دەبن، دواتر دەبێ جەنابی شێخ چی لەمن بوی کە منی کردۆتە جێگرەوەی خۆی دوای مردنی؟ ئایا من بەو ئەندازەی گوتی گرنگم؟ بێگومان ناخۆشی ئەو وشانەی بەر گوێم کەوتن وای لێکردم لەم بارەیەوە هیچ نەڵێم .. هەموو ئەو خەیاڵانەی ئەو شەوە بە دەریای ئاوەزمدا شەپۆلی دەدا، ئەو شەوەی چاوانم خەویان لێ تۆرا بوو و فرمێسکیان لێ تێزابوو.
دوای ئەوە شێخ هەر پازدە ڕۆژێك بە شەوەکانیەوە ژیا، پێش ئەوە چووە خەلوەتگاکەی و داوای کرد کەس بەسەریەوە نەچێت،.. تاوەکوو ڕۆژێك هات و نەخۆشیەکەی زۆر سەخت بوو، ئەو شەوە شەوی هەینی بوو، من و هاوسەرەکەم بۆ خزمەتکردنی بەدیاریەوە بە ئاگابووین، هەندێ وشەی چرپاندە گوێی کچەکەی

کە من لێی تێنەگەیشتم، دواتر خۆی خستە سەر لای ڕاستی و ڕوحی پاکی سپاردە پەروەردگاری.

بەم شێوەیە ڕوحی پاکی لە جەستەی پاکی جوایەز بوویەوە، ئەم خۆرەی کە ڕێگای خەڵکی ڕۆشن کردبوویەوە کوژایەوە، دەرگای ئاسمان بە ڕووماندا داخرا ، ئەو دەرگایەی کە هەرچی فەڕ و بەرکەت هەبوو لێی دادەبەزی لە پێناو ئەو بەندە خۆپارێزە ئیتر داخرا..

لە ئەرکە گرانەکەی حەسایەوە و ڕووی کردە جیهانی کۆتایی، ئەو جیهانەی کە چاکەکاران تیایدا باشترین پاداشتی چاکەکانیان پێ دەدرێتەوە، بە ئۆغری ئەو کەوتینە دڵتەنگیەکی قوڵەوە...

ناشتنی ئەو وەکوو ناشتنی ڕوحی من بوو لەگەڵ ئەودا، هیچ نەما تەنها جەستەیەکی لاواز کە توانای بەرگەگرتنی ناخۆشیی و سەختیەکانی نەدەگرت.

لە گەورەیی کارەساتەکە بیرم تێکەڵ و تووشی هێدمە بووبووم، هەرچی "سومەیە"ی هاوسەرمە کەوتبوویە دڵتەنگیەك هەر نایەتە باسکردن. دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی داخستبوو تا ئەو فرمێسکانەی بسرێت کە بنی نەدەهات، بە زامێکەوە دەینالاند کۆتاییان نەبوو. ئەو عەیامەك بوو جگە لە باوکی کەسی تری نەدەناسی.. ئەو باوکەی دوای مردنی دایکی هەموو ژیانی بە کچەکەیەوە پەیوەست بوو، ئەو باوك و دایك و برا و سەرپەرشتیار و هەم مامۆستای بوو، .... سومەییە تۆ خودا و ئارامگریت هەیە.... تۆ خودات هەیە.

دوای چەند خولەکێکی کەم لە مردنی جەنابی شێخ بانگبێژ بانگی بەیانی خوێند، لەگەڵ بانگی بەیانی هەوڵمدا و خۆم ڕاگیر کرد و وەسیەتی هاوسەرەکەم کرد

بەوەی ئارام بگرێت، بەڕاستی جۆرێك لە ئارامی و دڵنیایی بەسەریدا باڵیكێشا، هەواڵی پێدام كە باوكی جەنابی شێخ پێش كۆچی بە گوێیدا چرپاندوویەتی و وەسیەتی پێكردووە ئەو كاغەزە بخوێنێتەوە كە لە ژێر پشتیەكە دایناوە، كاغەزەكەی بۆ هێنام و خوێندیەوە، تێیدا نووسرابوو:

(( بسم الله الرحمن الرحيم، كل نفس ذائقة الموت و إنما توفّون أجوركم يوم القيامة.. )

ڕۆڵەكانم وەسیەت بێت دوای مردنم شین و ڕۆڕۆم بۆ نەكەن و بۆم مەگرین، بە مردنم وانە و پەند وەرگرن و جگە لە خودا پشت لە هەموو شتێك بكەن.

كوڕەكەم وەسیەتەكەمت بیر نەچێت، گەر لە ماڵەكەم بارتان كرد و جێتانهێشت" ماڵەكەم ببەخشنە خێزانێكی هەژار و بێ ماڵ بۆ ئەوەی ببێت خێرێكی نەبڕاوە دوای مردنم..

هەروەها تۆ كچەكەم، خەم مەخۆ و دڵتەنگ مەبە، بەیانی هەمووما لای خودا كۆدەبینەوە، لەوێ نە جیابوونەوە و نە خەفەت و دڵتەنگی هەیە. تكاتان لێ دەكەم تەسبیح و بەرماڵەكەم لەگەڵم بخەنە نێو گۆڕ و زۆر دوعام بۆ بكەن چوون من زۆر پێویستم بە دوعاكانتانە)

بۆ نوێژی بەیانی چووم بۆ مزگەوت، دوای ئەوەی كە بڕیارمدا مەراسیمی بە خاكسپاردنی شێخ بۆ دوای نوێژی هەینی دوابخرێت، ئەمەشم بۆ ئەوە بوو تا خۆشەویستان و فێرخوازان و موریدانی جەنابی شێخ ئامادەبن. دوای نوێژی بەیانی خۆم كۆكردەوە و هەواڵەكەم بە خەڵكی ڕاگەیاند، بەڕاستی هەموو خەڵك بەو هەواڵە شپرزە و خەمبار بوون.

دوای چەند ساتێکی کەم هەواڵەکە لە تەواوی لادێ و شار بڵاوبوویەوە و خەڵکی لە پیاو و ژن لە هەموو شار و لادێکانی دەوروبەر دەهاتنە ماڵی شێخ.

ئافرەتان ڕوویان لە ژوورەوە کرد و لای سومەی دانیشتن، من و پیاوانیش لە دەرەوە، دڵتەنگی بەسەر ڕووخساری هەمووانەوە دیاربوو، ئەوان ئەو باوکە دڵسۆزەیان لە دەستدابوو کە لە کاتی کێشە و تەنگانەدا پەنایان بۆ دەبرد و چارەسەریان لای ئەو چنگ دەکەوت. تاوەکوو بەیانی هەرواماینەوە.

دەستمان بە شووشتنی جەنابی شیخ کرد. بۆ ئەم کارە دوو لە قوتابیانی شێخم هەڵبژارد و خۆشم لەگەڵیان بووم، هەرکە قوماشە داپۆشەرەکەمان لە سەری لادا ڕووخسارێکی نووراني و ڕۆشنمان بە دیکرد، ئەمەش یەکەم موژدە بوو. چەند جوانە بەرووبوومی پەرستش و گوێڕایەڵی و تێکۆشانەکانت لە پەرستشەکان ببینیت، با ڕێبوارانی ئەو ڕێیە بە نموونەی وەکوو ئەمە هەڵبدەن و کتێبکۆشن.

لە نێو ئاپۆڕایەکی بە شکۆ لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان تەرمی جەنابی شیخ هەڵگیردرا و خەم و دڵتەنگی و پەژارەی دابڕان داڵدەیدابوون. بەو شێوەیە شێخمان سپاردەی دووا شوێنی کرد هەروەکوو چۆن وەسیەتی فەرموویوو تەسبیح و بەرماڵەکەییمان لەگەڵی خستە گۆڕەوە. داوامان لە خودا کرد بیبەخشێت و ئیمەش دوای ئەو تووشی فیتنە نەکات و لە پاداشتەکەی بێبەشمان نەکات.

خەڵکی بۆ کاروباری خۆیان گەڕانەوە ماڵەکانیان و منیش گەڕامەوە لای سومەیەی خێزانم و دڵمدایەوە و نەمدەزانی چۆن بە ئارامگرتن و دانبەخۆداگرتن وەسیەتی بکەم لە کاتێکدا خۆم ئاتاجی کەسێك بووم دڵنەواییە

بکات، بەڵام هیچ کێشـەیەك نەبوو، چـوون سـومەییە کچـی باوکیی خۆی بوو، لە باوکیەوە زانست و ڕازیبوونی بە قەدەری خودای بۆ مابوویەوە.

بۆ ئەوەی ئەو ناخۆشەیەی لەسەر سووك بێت باسی ئەو موژدانەم کرد لە لەکاتی شـۆردنی بینیمان پلەباڵایی جەنابی شـێخی نیشـاندەدا لای پەروەردگار، چـوون موژدەکان بەڵگەی ئاخیرخێریە، خەڵکی پلەوپایە و حاڵی تایبەت بە خۆی هەیە، براوە و بەختەوەر ئەو کەسەیە کە پەروەردگار بۆ خواپەرستی و تەقوا ڕێنموونی بکات.

چــوومە ژووره تایبەتیەکەی جەنابی شــێخ کە یەکێ لە لاکانی ژوورەکە بە پەرتووکخانەیەکی گەورە داپۆشرابوو، ژمارەیەکی زۆری پەرتووکی لە خۆگرتبوو، بە جۆرێك لەســـەر یەکی دانابوو کە لە زەویەوە بەرەو بنمیچــی ژوورەکە بەرز دەبوویەوە.

ئەوەی ڕوون بوو ئەوە بوو کە دووایین ئەو پەرتووکەی کە جەنابی شـێخ بەر لە مردنی خوێ خوێندبوویەوە پەرتووکێك بوو بە ناوی ( التذكرة في أمور و أحوال الآخيرة) ی پێشـــەوا قورتوبی بوو، چـــوون تەنها ئەو پەرتووکە لە دەرەوەی پەرتووکخانەکە و بە تەنیا دانرابوو.

هەندێك کاغەزیش بە پەرشوبڵاویش لە دۆڵابەکەی شێخ هەبوون، هەندێکم لێیان خوێندەوە و لە ناویاندا شـــیعرێکم بەدیکرد کە لەبارەی ئەقیدەوە نووســـرابوو بەڵام جەنابی شـێخ تەواوی نەکردبوو، دیارە مردن و قەدەر ڕێیپێنەدابوو تەواوی بکات.

هەندێك میسك و کوپێکیش هەبوو کە پاشماوەی قاوەی تێدا مابوو.

دەرگای کۆگای جلەکانی شـێخم کردەوە و بۆنێکی خۆش و پاکم کرد و چـاوانم ڕۆندکیان لێ تکا، ژمارەی جلەکانی یەکجار کەم بوون و زۆریش سـادەبوون، لە خام درووست کرابوون.

بوێری دانیشتنم لەسەر دۆشەکەکەی شێخ نەبوو، چوون جەنابی شێخ لە دڵمدا گەورەیی و شـکۆی جێهیشـتبوو، وام هەسـت دەکرد خۆی ئامادەیە و کۆچـی نەکردووە، بەڵکوو وام دادەنا کە ڕوحی جەنابی شـێخ لە ژوورەکە دەخولێتەوە.

مانگێك بەسـەر شـێخ و باوکم تێپەڕی بێ ئەوەی هیچ ڕێنماییەکی فێرخوازانی شێخ هەبێت.

بەردەوام سـەردانیان دەکردم و چـاوەڕێی شـتێکیان لە من دەکرد، مینا ئەوەی بڵێن : ئێسـتا ئێمە چـیمان لەسـەرە بیکەین و چـارەنووسمان چـی لێ دێت؟ دەمانەوێ لەسەر ئەو ڕێگەیەی کە جەنابی شێخ بۆی دیاریکردبووین بڕۆین، بۆیە پێویسـتیمان پێتە... تۆ جێگر و کوڕی ئەوی، ئەگەرچـی ئەو کوڕی نەبوو، بەڵام تۆ خاوەن پێگە و پلەبوویت لای ئەو، ئێستا پێمان بێژە چی بکەین؟

بەم شێوەیە لە چاوانیان ئەوەم دەخوێندەوە، ئەگەرچی هەندێکیان بە ئاشکرا و شەرمەوە ئەوەیان پێگوتم، هیچ بڕیارێکم نەدا، ئەگەرچی بەردەوام بووین لەسەر ویردەکان و هەموو پێنج شـەممەیەك کۆڕی زیکرمان دەبەسـت لەگەڵ فێرخوازان و موریدانی شێخ، دوای مردنی جەنابی شێخ کەس ناهاتە ڕێزی تەسەوف، چوون من مژوڵی ڕێکخستنەوەی ژیانم بووم و بە کاری لە پێشینەم دادەنا.

دوای ئەوەی ئەو پەرتووکانی کە جەنابی شـێخ بۆ فێرخوازانی دانابوو لە ڕاڤە و خوێندنی بووینەوە پێشـنیارم بۆ هاوسـەرەکەم کرد بچـینەوە زێدی خۆم بۆ

ئەوەی لەویٚ ژیانمان جێگیر دەبێت، بڕیارم دابوو لە زێدی خۆم بنکەیەکی فێربوون و بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری بکەمەوە. هەرچی دەربارەی کۆڕی زیکر و تەریقەتیشە داوام لە " شێخ ئیسماعیل" کرد کە ئەو ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ، چوون ئەویش لە لایەن "شێخ مەهدی" پێش مردنی ئیزنی لە ئەستۆ گرتنی ئەو کارەی پێدرابوو، داوام لێکرد ئەو لە بریی من سەرپەرشتی کۆڕی زیکر بکات، چوون من دەچوومەوە زیدی خۆم، بەڕاستی ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ و ڕەزامەندی نواند.

تەواوی پێویستی و کەوپەلەکانمان کۆکردەوە، تەنانەت هیچ شتێکمان جێنەهێشت، هەرشتێك ئی گواستنەوە بووبێت گواستمانەوە، ئەمەش بۆ پارێزگاریکردن لە یادگاریەکان و پەیمانەکەم بوو.

خانووەکەشم بە بێوەژنێك بەخشی کە چەند منداڵێکی هەبوو و لە خانوێکی دراوسێمان کرینشین بوو، وەسیەتەکەی جەنابی شێخمان جێبەجێ کرد.

خۆم و هاوسەرەکەم کە کۆرپەیەکی لە نێو سکیدابوو گەڕاینەوە زێدی پێشووم و لە خانوی کۆنمان نیشتەجێ بووین.

چووینە ناو خانووەکە و خەمێکی بێدەنگی کەڵەکەبووم بەسەر ڕووخساری سومەیەدا بەدیکرد، وام گومان برد ئی یادی باوکی یان جێهێشتنی خانووەکەی پێشومان بێت، ئەو خانووەی کە تیایدا گەورە بووە.

لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد و وەڵامی دامەوە و گوتی: هەستم بە تەنهایی دەکەم، بەتایبەت کاتێ ئەو خانووە نەخشێنراوە بنمیچ بڵندەی بینیوە، وای هەست دەکرد کە دونیا بانگی دەکات و ئەمیش دەترسێت کردە و چاکەکانی

پێشـــووی بە هەدەر بڕوات. لە چـــاوانی ڕۆندکی بێدەرەتانی دەتکا، ئای لە دڵە ناسکەی !

زەردەخەنەم کرد و هێنامە نزیکی خۆم و پێم گوت: لە هیچ مەترســـە: بە هۆی دوعای باوکت بۆمان ژیانمان خۆش دەبێت ئینشـــائەڵلا، بەبیرت بێت تا ئێســـتا خانوەکەمان لەوێ ماوە، کەی حەزت کرد ســـەرێك دەدەین و دەچـــینە ئەوێ.

بەڵام سومەیە گیان پێم بڵێ: ئایا تۆ لەگەڵ من دڵخۆشی یان نا؟

لەسەر ڕووخساری بزی ڕەزامەندی دەربڕی و گوتی: ئێستا واز لەوە بێنە، من بە هۆی ماندوبوونی گەشـت شـەکەتم، پێویسـتە پێش ئەوەی ناوماڵ ڕێکخەن کەمێ پشـو بدەم.. چـوو سـەیری ناو ژووری خانووە فراوانەکەی دەکرد و گەڕلیەوە و گوتی: باشە ژووری خەوتن کامەیە؟

گوتم: بۆچی لە پرسیارەکەم ڕادەکەیت؟

زۆر شـــەرمن بوو، هیچ هەڵوێســـتێکی نەبوو تەنها هاوڕابوون نەبێت، هیچ کات وەکوو هاوسەرانیتر کێشە و ڕاجیایامان نەبووە

گوتی: هچ کێشـە نیە بەیەکەوە شـیاوترین ژوور هەڵدەبژێرین، لەگەڵ قسـەکانی بزەی هاوسەرێکی دڵخۆش و ڕەزامەندنی دەنواند.

فەزڵ و گەورەیی و بەخشـشـی خودا و ڕێز و چاکەی باوکی بوو کچـەکەی بووە هاوسـەرم، هاوسـەرەکەم ئەو ئافرەتەبوو کە پیاوانی وەکوو من بۆ ڕۆشـنکردنی ژیانیان و یارمەتیدانیان لە  کاتەسەختەکان ئاتاجیانین.

ئەوەندەی نەبرد چـــەندین کۆمەڵە و چـــەندین کەس لە ناوچـــە جیاوازەکانی دەورووبەر هاتنە لام، هەیانبوو بۆ ســـەردانی هاتبوو، تێیاندابوو بۆ دوعا هاتبوو،

هەندێکیش بۆ داواکردنی زانســـت و خوێندن هاتبوون، کەمێکیش بۆ وەرگرتنی تەریقەت هاتبوون، بۆیە پێویســـت بوو لەســـەرم مزگەوتێك بنیاد بنێم، ئەو شـوێنەی پێشـتر بەرنامەم بۆی دارشـتبوو، زەویەکی فراوانم دیاریکرد و بە دیوار دەورم گرت و مزگەوتێکم لەسەر بنیادنا.

ئەو مزگەوتەمان ناونا " مزگەوتی شـــێخ مەهدی" بۆ ڕژانی فەڕ و بەرەکەت بە هۆی جەنابی شـــێخەوە، جگە لە مزگەوتەکە دوو نهۆمی گەورەش بنیادنرابوو، نهۆمێکیان بۆ مانەوەی ئەو قوتابیانە بوو کە نیازی مانەوەیان هەبوو بۆ خوێندن، نهۆمەکەی تریش شوێنی خوێندن و وانە گوتنەوە بوو.

بۆ وانە وتنەوە سوودم لە یارمەتی قوتابیانی شێخ مەهدی بینی، هەروەك چۆن شێخ ئیسماعیلیش خۆی دەهات و کۆڕی زیکری پیرۆزتر دەکرد.

هەموو شەوانی پێنج شەممە دوای عیشا کۆڕی زیکر دەبەسترا.

لەگەڵ وابەستەییمان بە هەموو ئەمانە، خودا منداڵێکی لە سومەییە پێبەخشیم و ناونانا " مەهیدی" بەناوی شـــێخی باوکمان کرد( ڕەحمەتی خودای لێبێت)، پێشتر سومەییە لە کاتی دوگیانیدا باوکیی لە خەودا بینیوە و ئەویش منداڵەکەی بە باوکیی داوە و جەنابی شێخیش سەیری کردووە و دوعای پیرۆزی بۆ کردووە و ماچی کردووە و ڕۆییوە، ئەمە موژدەیەکی دڵخۆشکەر بوو سپاس بۆ خودا.

بە شێکی زۆری تەمەنم بەم شێوەیە گوزەراند، لە نێوان زانست و وانە وتنەوە و پەرستش و زیکر و بیرکردنەوە، بە شەو لە کاسەی نزیکیی خودا دەمنۆشی و بە ڕۆژیش لەگەڵ قوتابی و موریدانم چێژم لە زانست دەبینی .

لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنم و گەیشتم بە (چل و نۆ ) ساڵ، تا ئەو دەمە جگە لە " مەهدی"ی کوڕم هیچ منداڵێکی ترم نەبوو، سپاس بۆ خودا.

زۆرێك لە ڕاستییەكانی ئەم گەردوونەم بۆ ئاشكرابوو، ئەمە هەمووی بەروبوومی ئەو زانستە بوو كە لە جەنابی شێخ و مامۆستام بۆم بەجێ مابوو، هەروەها بەرهەمی ئەو ملكەچییە بوو كە بۆ پەرستشەكان هەمبوو، هەروەكوو لە فەرموودەیەكی قودسیدا پەروەردگار دەفەرمووێ: ( گوێڕایەڵمبە دەتكەمە بەندەیەكی ڕەبانی، بڵێیتە هەر شت ببە ئەویش دەبێت).

چێژی بەرووبوومی ئارامگریی و چارەنووسیەكەییم كرد، ژیان بە درێژایی ئەو ماوەیە بێ لەكە و خۆش و شادیی بوو. چوون سروشتی ژیان تاڵ و پڕ خەوشە، گەر ڕۆژێك باش بیت بێگومان چەند ڕۆژێك خراپیت بۆ دێنێ و شتانێكت دێنێتە پێش ژیانت لێ تاڵ دەكات و سافیەكەی ناهێڵێ.

جا بەڕاستی تووشی ناخۆشترین كاتی كردین.

ڕۆژێك خۆم و خێزانەكەم بە دەنگی تەقینەوەیەكی گەورە و چەند دەنگێكی بیزاركەر و ترسێنەر بەئ اگا هاتین،... ئەمە ئەو جەنگەیە كە ونبوو و شەل و پەڕاگەندە جێدێڵێت، زەوی بە ڕەنگی خوێن ڕەنگرێژ دەكات.

ئەو ڕۆژە میسر ڕەنگی ڕەشی پۆشی و پرسەی ڕاگەیاند و خەمێكی گەورە هەموو میسری تەنی.

زیانێكی گەورە بوو بۆ ئەو سوپایەی كە وەك ئاو و هەوایە بۆیان،.. دڵتەنگی هەموو كونجێكی وڵاتی گرتبوو، تەواوی شوێنە جیاوازەكانی وڵات بەیەكەوە لە خەم و ژیانێكی پڕ لە ناسۆری و شەكەتی دەژیاین.

تەنانەت ئەو دەروێشانەش هەمان ئازاری ئەو خەڵكەیان دەچەشت، ئەوەی پێیانكرا لە یارمەتیدانی ئەوانیتر و لەخۆگرتنیان" ئەنجامیاندا، داوایان لە خودا

دەکرد هەرچی ئەم بەلاّ و قەیرانە تێپەڕێنێت و دەروی خێر و خۆشیان بەڕوودا والاّ بکات.

هەرچی لە توانای خەڵکی هەبوو لە ماڵ و سامان و شتیتریش خستیە خزمەت سوپا و دووبارە ڕێکخستنەوەی سوپای نیشتمانی، ئەو سوپایەی کە قەلغانی ئاسایش بوو، هەموومان دەمانویست بۆ یارمەتیدانی سوپاکەمان بچینە بەرەکانی جەنگ، بەڵام دەسەڵات ئامۆژگاری خەڵکی کرد کە ئەمە خزمەت بە ئێمە و بە نیشتمان ناکات.

ئەو کەسە درۆی کردووە کە گوتوویەتی دەروێشەکان کەسانی هەژار و لە کەتوار دوورە پەرێزن و گرنگی بە کاروباری نیشتمان نادەن و هەوڵ بۆ خزمەتی نیشتمان ناخەنەگەڕ، .. بە پێچەوانەوە، خۆشەویستی نیشتمان و خۆبەختکردن بۆی هەر لە دێر زەومانەوە خاسیەتەکی دیاری ئەو کۆمەڵەیە بووە، پەرتووکی ژیاننامە و مێژوویەکان دیارترین گەواهیدەری ئەو ڕاستیەن، تژیە لەو هەڵوێستانەی کە لە خزمەت نیشتماندایە.

ئەو ماوە سەختەی کە بە هۆیەوە کەوتینە ژێر کاریگەری قەیرانی ئابووری و دەروونی بە سەررماندا تێپەڕی، بەڵام لە سەری ئارامامان گرت، چەکی دەستمان ملکەچی و پاڕانەوە بوو لە پەروەردگار.

لە نێوان خەم و پەژارە و خۆگونجاندن و موژدە و ڕۆیشتنی سەرۆك و هاتنی یەکێکیتر، ئەو شەوە هات کە تیایدا بڕیاری شەڕ و گەڕانەوەی شکۆ و زەوی داگیرکراو درا.

بیرم دێ چوار ڕۆژ بەر لەوەی جەنگ دەست پێ بکات، چوم سەر گۆڕی جەنابی شێخی کۆچکردووە و داوام لە خودا کرد و بە ڕەجای پێغەمبەرە بەڕێزەکەیی و

چاکەکاران داوام کرد ئەو بەلاَ و ناخۆشیە کۆتایی بێت و موسڵمانان سەر بخات و ئاشتی و ئارامیی و ناز و بەخششەکانیمان بۆ بگێڕێتەوە.. پیاو چاکان تەنها بە مردنیان پەیوەندیان لەگەڵ ئێمە نا پچڕێ، هەروەکوو جەنابی شێخ پێشتر ئەوەی فێرکردبووم .

ئەقیدەم وابوو کە ڕوحی شێخەکەم لەگەڵدایە، دڵنەوام دەکات و ئاراستەم دەکات، بێگومان ڕوحی مەردانی خوددا لە بالاَترین شوێن و پلەدایە، لای پەروەردگار تایبەتمەندی خۆی هەی

هەرچی ڕوویدا لە کۆتاییدا وڵاتەکەمدا لەو بەلاَیەی بەسەریدا هاتبوو ڕزگاری بوو و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، لە هەموو بارێکدا سپاس بۆ خوا، بەخششی ئاسایش و جێگیربوون گەڕایەوە قۆناخی سەرەتا.

سەیری خۆم و ژیانم کرد بینیم کە تەمەنم هەڵکشاوە و پیری سەری داگیرکردووەم و بەرگی سپی پێ پۆشیوە، تەنانەت کوڕەکەم گەیشتۆت تەمەنی بیست و دوو ساڵ، .. گەشاوەیی گەنجێتی لە ڕووخسارە ڕۆشنەکەیدا خۆی دەنواند. لە جوانی و نازدارییدا مینا دایکی گەشاوە و کەشخە بوو، دەتگوت بەشێکە لەو ڕوحی بە بەردا کراوە.

پەرتووکی زۆرێك لە گەورە مەردانی تەسەوفم خوێندەوە، بە هیوا بووم شوێنپێیان هەڵگرم پێش ئەوەی هێزم نەمێنێ و لەپەلوپۆ کەوم، بەلاَم نەمتوانی، شتانێك لە ژیاننا مە یان دەبینم هۆکارن بۆ گیان بە بەرداکردنی هەولە کرچووکاڵەکەم و جولاَندنی ئەندێشەم، بەرووبوومەکەی بریتیە لە کارکردن و بەرچاوڕوونی و بالاَیی بینینە.

له بارەی گەشتەکانی سەر زەویشیان شتانێك خوێندۆتەوە... پەرستشی گەشتکردن،، ئەم جۆرە پەرستشە لەو سەردەمەی ئێمەدا بە جۆرێك نەماوە، بۆ جۆری تر بۆ گەشتکردن و مەبەستی تر گۆڕدراوە، کە هیچ پەند و هێمایەکی گەورەیی خودای تێدا نابینرێ.

وا گومان دەبەم ئێستا کاتی ئەوەیە کە خۆم یەکلایی بکەمەوە بۆ پەرستشی گەشت لەو زەویە فراوانەی خودا، کوڕەکەم ببووە پیاوێك دەتوانریا بۆ ڕاییکردنی کارەکان و چاودێریکردنی کاروباری ماڵ لە دوای من پشتی پێ ببەسترێ.

نیازی گەشتم هێناو پێداگیربوم لەسەری، داوای ڕێپێدانم لە هاوسەرەکەم کرد، کاتێ بینی پێداگیرم نکۆڵی نەکرد و هیچ راوبۆچوونێکی دەرنەبڕی.

سەیرێکی مزگەوت و فێرگەکەم کرد کە کارەکانی لە سەر ڕێڕەوی خۆی دەڕۆیی، ئەرك و بەرپرسیاریەکەم بە " شێخ ئیسماعیل" سپارد تا لە گەشتەکەم دەگەڕێمەوە.

ئەو دەمەی خەریك بوو دەڕۆیشتم کەمێك لە جل و پارەشم دانا، خواحافیزیم لە هاوسەرەکەم کرد، کوڕەکەم ویستی تا وێستگەی شەمەندەفەر هاودەمیم بکات، بەڵام من ڕێگریم لێکرد لەگەڵم بێت، خواحافیزیم لێکرد و ڕۆیشتم، بە هیوای ئەوەی لە بەخشش و پاداشتی خودا نغرۆبین و منەت بفەرمووێت پلەی زانین و ئاسۆیی بینینمان فراوان بکات و زانینی نهێنیەکانی خۆیمان بخاتە دڵ.

ئاراستەی ڕۆیشتنەکەم بە ڕێك و پێکی پێشوەختە نەبوو، وام دانەنابوو بچمە ئەوپەڕی باشوور کە ناوچەی ئەسوانە، دواتر چوومە سوودان و پاشان بۆ خاکی ئەفریقا، ئەم شوێنانە پێشتر ڕوگەی زۆرێك لە پیاوچاکان بوو، شوێنی

چـــاوتێبڕینی پیاوچـــاکان و مەردان بوو، ئەمەش لەبەر ئارامی و ســـروشـــت و ڕەوشتجوانی خەڵکەکەی و بە پیتی خاکەکەیان بوو، بە پێچەوانەی شوێنەکانیتر. ســـواری شـــەمەندەفەرەکە بووم و عەبایە ســـپیەکەم پۆشـــی بوو و مێزەرە گەورەکەشم بەستبوو، گۆچان و تەسبیحکەشم بە دەستەوەبوو.

شـــەمەندەفەرەکە تژی بوو لە خەڵك، هەریەکەیان نغری دەریای خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆیان بوون، خەمبار و ڕارا بوون، یەکێ خەمی ڕۆژی بوو ئەویتر ئی ماڵ و منداڵ..

کاری مرۆ زۆر ســـەیرە! خودا ڕۆزی بۆ درووســـت و فەراهەم و دابینکردووە و فرمانی پێکردووە کە جگە لە پەرســـتش بە شـــتی تروە ماندوو نەبێت، کەچـــی پێداگیرە لەسەر ئەوەی کە خۆی ماندوو بکات و بەشتی کەم نرخ مژوڵ بێت، چی دەبوو گەر خۆیان ڕادەســتی خودا بکردبا و خوداش دونیای ڕادەســت دەکردن و سەلامەتیش دەبوون لێی، وەلێ لەبەر ئەوەیە دڵنیا نین.

دوای چەند سەعاتێك و ماندووبوونێکی زۆر گەیشتمە (ئەسوان)، وتم گەر بچمە هۆتێلێك لە هۆتێلەکانی شار بۆ پشوودان باشترە.

لە باڵەخانەی پشـــت وێســـتگەکە بە ڕێکەوت چـــاوم بە پیاوێك کەوت، جلەکانی چرکن و ڕیشی درێژ و تۆزاوی بوو، هیچ شتێك لە سەر پرچە چڕ و تێکەڵەکەی نەبوو. گۆچـــانێکی لە دەســـت بوو ســـەری گۆچـــانەکە بەرەو تیژی دەچـــوو، بە دەستەکەی تریەوە جۆرکەکی بەتاڵی هەڵگرتبوو.

کە منی بینی هاتە لام و بە پســـتە پســـت قســـەی دەکرد، زۆر بە ئەســـتەم لە ماناکەی گەیشتم، دەیگوت: شتێکم پێ ببەخشە لەوەی پێت بەخشراوە!

بزەیەکم بۆی کرد و دەست بۆ گیرفانم برد و هەندێ پارەم پیشکەش کرد، سەری سوڕاند وەکوو ئەوەی نەڕازی بێت و گوتی: ئەوە! من لەو جۆرەم زۆرتر لە کنە! زانیم ئەوە دێوانەیە و شـێت و هەژار نیە! پێمگوت: چـیت دەوێت؟ خودای گەورە شتی زۆری پێبەخشیووم.

کابرای دێوانە بە دەنگێکی بڵند و بیسـتراو دایە قاقای پێکەنین و گوتی" مەهدی... مەهدی..

کەوتە دڵم کەوا مەبەستی ئامۆژگارییە، بۆیە پێم گوت: (( ئەو درووستی کردوویت و تۆش بەندەی ئەویت، چـاوی ئەو لەسـەرتە، بەو پەیوەسـتبە و بۆ ئەو پەیوەسبە، ڕوو لە هەر کوێش بکەن ڕووی خودا لەوێیە))!

کاتێ گوێ لەم وشانە بوو لەسەر پێیەکانی هەڵپەڕی و هاواری دەکرد..ئەڵڵا. ئەڵڵا ..ئەڵڵا..دواتر ڕۆیی و لێم بزر بوو.

زۆر سـەیرە کاری ئەمانە ئەقڵ سـەری لێ دەرناکات، ..زۆر ماندووبووم نەمدەتوانی زۆر بیر لەو پیاوە بکەمەوە، ئەوەی ئێسـتا پێویسـتمە تەنها پشـوودانە، کەوتمەڕێ بەرەو ئەو هۆتێلەی لەسـەر ڕێگاکە بوو، باڵەخانەیەکی گەورە لە دوورەوە دەردەکەوت، کاتێك تەنها بۆ خەوتن مامەوە لە ژوورە یەککەسـیەکە و بۆ ڕۆژێك بە کرێ گرتبووم، دیمەنی جوانی ژوورەکە و ڕەنگە لێهاتووەکەی سـەرەنجی من و هەموو ئەو خەڵکەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا و بێ دوو دڵی هەڵیاندەبژارد.

هەر چـوار لای دیواری ژوورەکە لە چـاوی من وێنەی دونیا بوو، جوانی و ڕازاوەییەکەی هەر لەو وەرگرتووە تا وای لێهاتووە کرۆکی ئەقڵ دەبات و بەسـەر دڵەکاندا فرمان دەکات، ئایا دەبێ چـەند کەس پێش من لەو ژوورە مابێتەوە و

دواتر بە ناچاری جێیهێشتووە، دوای منیش چەندیتر دێن و کە کاتی ڕۆیشتنیان هات ئەوانیش ئەو شوێنە جێدێڵن... ئەمە دیارترین ماناکانی دونیایە، هاتن و چوونە، مانەوە و بارکردنە... ئایا کەس هەیە پەند وەربگرێ؟!

لە بەیانیەکی زووی ڕۆژی دواتر بە پێویستیەکانمەوە هۆتێلەکەم جێهێشت، ڕوومکردە گۆڕستان، چوون ئەم شوێنە یەکەم شوێنی پەند وەرگرتنە گەر خاوەن دڵێکی بە ئاگابووین، بە نیازی دوعاکردن و وەرگیران و سوودمەندبوونی دوعاکار و دوعا بۆ کراو: ( والذين جاءوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا و لإخواننا الذين سبقونا بالإيمان)

گۆڕستانەکە دەرگایەکی گەورەی هەبوو، لەلای دەرگاکە وەستام و دوعای چوونە ژوورەوەم کرد، لە دوورەوە شێخێکی بە تەمەنم بینی لەگەڵ قوتابیەکانی لە کن گۆڕێك دانیشتبوون و دوعایان دەخوێند، لەوانەیە ئەمە گۆڕی پیاوچاکێك لە پیاوچاکان یان شێخێك لە شێخەکانیان بێت و ئەوانی جێهێشتبێت.

ئەو هەڵەم قۆستەو بەرە و ڕوویان هەنگاومنا، .. وا تێگەیشتم کە بەڕاستی ئەوان بۆ سەردانی شێخی پێشوویان هاتبوون، ئەو پیاوە پیرەی لەگەڵیان بوو شوێنگرەوە و خەلیفەی شێخە مردووەکە بوو.

چەند مەترێك لە گۆڕەکە بە شکۆ و ڕێز و ئارامیەوە وەستابوون، مینا ئەوەی مردووەکە زیندووبێت و لەگەڵیان قسە بکات، .. ئەمە وای کرد مەراق و خەیاڵم بۆ شێخ و مامۆستاکەم بڕوات، مانای پەیوەندی ڕوحیم بیرکەوتەوە کە چەندین جار جەنابی شێخ بۆی باسکردووم، لە کۆتاییدا پیاوە پیرەکە دوعای کرد و ئێمەش لە دواوە ئامیذمان بۆی دەکرد، دوای ئەوەی تەواو بوو گومانی برد

کەسێك لە دواوەیەتی و ئاوڕیدایەوە و هاتەلام و بە ڕوویێکی خۆش" کە نغرۆ بوو لە میهرەبانی و خاکێتی و بە گەرمی سـڵاوی کرد... لە ناو و وڵاتمی پرسـی، وا گومانی برد جۆرێك لە پەیوەندیم لەگەڵ شێخە مردووەکەیان هەیە.

پاشـان قسـە و باس گەیشـتن بە باسـی تەسـەوف و ڕەفتار و ئادابی سـەردانی کردنی گۆرسـتان، ئەو باسـەی کە زۆرێك لە خەڵکی لەبەر کەم زانسـتیان لێی بێئاگان، بە ڕێز و ئەدەبەوە گفتوگۆم لەگەڵیدا دەکرد، لە قسەکردنیدا هەستم بە خەم و پەژارەیەك دەکرد.

هاوڕێکەم لە قسـەکانمدا هەسـتی کردبوو زۆر وتەکانی شـێخەکەم بە بەڵگە دێنمەوە، گوتی: ئەو شێخە کێیە کە باسی دەکەیت و قسەکانی بەرز دەنرخێنی؟

پێمگوت: ئەو کەسـە شـێخ مەهدیە، ئەو بەڕەحمەت بێت شـێخ و گەورەی منە، پیاوەکە توند لە باوەشـی کردم و نێوچـاوانی ماچ کردم، زۆر بە گەرمی سـڵاوکردنی چـەندبارە کردەوە، باسـی ئەوەی کرد کە ئەو زۆرباش جنابی شـێخ دەناسـێ و خۆیی و چـەند فێرخوازێکی لادێکەیان بەشـێك لە پەرتووکی (ئیحیا علومو دین) ی پێشـەوا غەزالیی لای بەڕێزیان خوێندووە، سـێ بەشـی پەرتووکەکەیان تەواو نەکردووە.

پیاوەکە کە زانی من جێگرەوەی جەنابی"شـێخ مەهدی"یم، سـوێندی دام کە لەگەڵیان بچم و پەرتووکەکەیان بۆ تەواو بکەم.

لە سـەرەتادا ڕەتمکردەوە و هەوڵمدا بیانوێکیان بۆ بێنمەوە، بەڵام پیاوەکە زۆر پیداگیری نواند و شەرمم کرد و ناچار بووم بە داواکاریەکەی ڕازیی بم.

کەمێ بە پێ بەرەو لای دەرگای گۆڕستان ڕۆیشتین و موریدانیشمان لەگەڵ بوو، هەمان ئەو دیوانەیەم بینیەوە کە پێشـتر پرسـیاری لێکردم... لەبەر تینی خۆر

دانیشـــتبوو و لە دەوری شـــتێ دەخولایەوە کە بە دەســـتەوە گرتبووی، ئۆتۆمۆبێلێکی کرێمـان گرت کـە مۆدێلی کۆن بوو، بـەرەو لادێی شـێخ و موریدەکانی بەڕێکەوتین.

لەلای شێخ " صەفا" میوانی بووم، ئەمە ناوی ئەو پیاوە بوو، لە سەر خواستی ئەو لە ماڵی ئەو مامەوە، لەبەر جەنابی "شـێخ مەهدی" زۆر ڕێز و چـاکەی بەرامبەرم نواند.

بۆ ڕۆژی دووەم بە بەرەکەتی خودا دەســـتمان بە گوتنەوەی بەشـــی دووەمی پەرتووکەکە کرد، کاتی خوێندنەکەشمان دوای نوێژی بەیانی دەستی پێدەکرد، چوون ئەو کاتە پیرۆز و بە فەڕە و گوێگرتن و ئامادەیی مرۆ لەوپەڕی چالاکیدایە، هەروەها بۆ ئەوەی لە ڕۆژدا بە کارە تایبەتیەکانی خۆم بگەم.

لە بەیانی ئیزنم لە جەنابی شێخ خواست دەمەێ بە تەنها بە ناو لادێدا پیاسەیەك بکەم، ئەو پێداگیر بوو لەوەی خۆی لەگەڵی هاوڕێیەتی بکات، بەڵام من ڕازی نەبووم، ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کە جەنابیان لەکار نەکەم، لە کاتێکدا ئەو مژوڵی خوێندنی ویردەکانیەتی و پەروەردەکردنی موریدەکانی لە ئەستۆیە، بەڵام لەبەر ئەو داوام کرد کە یەکێ لە موریدانیم لەگەڵ بنێرێ، ئەویش بەمە ڕازی بوو.

لەگەڵ یەکێك لە موریدە بچووکەکانی کە ناوی" مالیك" بوو چووینە ناو لادێکە، لەکاتی پیاسەکەمدا دەرگای قسە و باسم لەگەڵ موریدەکە کردەوە نەخواستە تووشی شەکەتی و وەرسی بێت، زۆر بە ڕەوشت و ڕێزبوو، بۆی باسکردم کە زۆر دڵخۆشە بە شێخەکەی، گومانی باشی پێدەبرد، وا گومانی دەبرد کە شێخەکەی یەکێکە لە پیاوچاکە تایبەتیەکانی خودا.

ئەو گەنجە تووشی سەرسوڕمانی کردم، پێویستە هەموو موریدێك گومانی باش بە شێخەکەی ببات، شێخ ڕێنیشاندەر و ڕێنویکارە بۆ لای پەروەردگار، ئەمەی لە پێغەمبەرەوە بۆ ماوەتەوە، زانایان میرتگرانی پێغەمبەرانن، لەسەر موریدی پێگەیشتوو پێویستە خۆی بەسەر موریدی شێخێکی تر بە گەورەتر نەزانێ، چوون هەمووان لە کانیاوی پێغەمبەرەوە دەنۆشن.

پێی ڕاگەیاندم کە لادێکەیان خاسێتی ئارامی بەسەردا زاڵە و خەڵکەکەش یارمەتیدەری یەکترن و خۆشەویستی لە نێوانیاندایە، هیچ شتێك نیە ڕیزەکەیان تێك بدات و لێکیان جوایەز بکاتەوە.

بۆی باسکردم کە هیچ ناخۆشیەك لە نێوان شێخ و کەسدا نیە، بەڵام بەردەوام لەگەڵ کەسێك ناکۆکە کە بە " شێخ یاسین" ناودەبردرێت، خەڵکی زۆر لە شوێنی جیاواز بە مەبەستی شیفا دێنە لای، شتی زۆر سەیر و سەمەرە و نەکردە ئەنجامدەدات و خەڵکی بە کەڕامەتی دەزانن، وەڵی نوێژ ناکات و ڕەفتاری پێچەوانەی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەرە، ئەمە خاڵ ناکۆکی نێوان جەنابی شێخ و ئەوە، خەڵکێکی زۆری لە ترسناکی ئەو پیاوە ئاگادار کردۆتەوە و ڕێگریان لێدەکات بچنە لای، ئەمە وایکردووە نێوانیان گرژی تێ بکەوێت.

لادێکە زۆر هێمنە و ڕووبەرەکەی بچووکە، دانیشتوانیشی زۆر کەمە و چێژ لە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ یەکتر دەبینن و سنگفراوان و خۆشخو و لەگەڵ یەك تەبان، زۆریشیان حەز بە ڕێبازی تەسەوفە، وەکوو شێخ حەز بە گۆشەگیری دەکەن و دوورن لە تێکەڵی و ژاوەژاو، چەندین خواناس هەیە ئاوەدانی و شاری جێهێشتووە و لە بیابان و چۆڵایی نیشتەجێ بوون، ئەمەیان بۆ مەبەستی

گۆشەگیری و لەگەڵ خودابوون و یەکلایی بوونەوە بۆ خزمەت، مەبەستیان بووە تەنها لەگەڵ خودا بن و دوور بن لە خراپەکاران و ڕێگران .

دوای پیاسەیەکی کورت لەگەڵ گەنجەکە گەڕامەوە ماڵی شێخ " صەفا"، پرسیاری ئەو کەسەم لێ کرد کە بە شێخ یاسین ناودەبردرا، بەڵام ئەو تەنها بەوەندە وەڵامی دامەوە و گوتی: خودا لە ئێمە و ئەو خۆشبێت و ئێمە و ئەویش ڕێنموونی بکات.

ئەمە خاسێتی ڕێبوارانی ڕێی تەسەوفە، ئەوان وابەستەی ئایینەکەیانن و داپۆشەری کەموکوڕی خەڵکین، ئەوان باش دەزانن کە گوناه شتێکە وابەستەی مرۆڤە و چاودێرە بە سەریەوە، لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەبێت جەنابی شێخ صەفا شێوازی قسەکردنی گۆڕی و بە نەرم و نیانی زیرەکیەوە باسی کرد.

لە شەوی چوارەمی هاتمم بڕیارمدا بچمە یەکێك لە مەیخانە بچووکەی دەورووبەری لادێکە، کاتێ کە پیاسەی لادێکەم دەکرد کەوتە بەرچاوم، وەلێ ئەوکات داخرابوو.

داوام لە گەنجەکە کرد هاوڕێیەتیم بکات بۆ مەیخانەکە، ئەو بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردم و هێدمە گرتی بوو، وەلێ لەبەر گومانباشیی و ستاشی شێخەکەی بۆ من" هیچ هەڵوێستێکی نەڕازیبونی نەنواند.

مەیخانەکە بچووک و دیوارەکانی چڵکن و کۆن و داڕووخاوبوو.

کاتێ چووینە ژوورەوە چاوی دانیشتووان کەوتە سەرمان، چوون ئەوان باش گەنجەکەیان دەناسیی و دەیانزانی قوتابی"شێخ صەفا" یە و لایان سەیر بوو لە جێگایەکی لەم شێوەیە ئامادەیە، هەروابێتەوە سەر و هەنیەی منیش ئی ئەوەی

نەبوو لە ڕێبوارانی ئەو ڕێیە بم!! هەندێ گومانی ئەوەیان برد کە لەگەڵیان بەشـــداری خواردنەوە دەکەین، بە زوبانی حاڵیان دەیانگوت: هەر تەنێ ئێمەن نین سـەر دەخەین شـوێنی ئەوها، ئەوەتا ئەوانەی بانگەشـەی خۆپارێزی و زانستیش دەکەن وا لێرەن..

زۆرێك لەوانەی نغرۆی گوناه بوونە حەزدەکەن خەڵکی هەمووی وەکوو ئەوان تووشـی گوناه بێت تا کەس لۆمەی ئەو نەکات و بیانووی بۆ گوناهەکەی هەبێت، زۆربەی خەڵکیش وەکوو ئەمانن، تەنانەت ئەوانەی خواپەرست و چاکەکارن یان ئەوانەی خەڵکی گومانی باشیان پێ دەبات..

هەندێك بە پەشـۆکاویەوە بۆمان دەڕوانن، بە زوبانی حاڵیان دەڵێن: دەبێ چـی ئەوانی هێنابێتە ئێرە؟ ئەو شـوێنە بۆ خواناسـان جێیەکی شـیاو نیە، ئێمە بە هیوای ئەوە بووین بێینە لای ئێوە و گوناهەکانمان بێنیدیە لای ئێوە و ئێوە ڕزگارمان کەن" نەوەك ئێوە بێنە شـوێنێکی نزمی ئەوها، هەر بەڕاسـتی چـی ڕوویداوە؟

بێئاگابوون لەوەی من و گەنجەکە بۆچی هاتووین، ئیمە لەسەر چوارپایەکی نزیك لە دیوار دانیشـتین، دواتر پیاوێك کە خاوەنی شـوێنەکە بوو بە شـەرمەزاریەوە بەخێرهاتنی ئێمەی کرد، پێیگوتین: چی دەخۆنەوە بەڕێزان لەو شەوە خۆشەدا؟

پێمگوت: مەییمان پێویست نیە..

بە سـەرسـوڕمانەوە گوتی: بەڕێزم لێرە جگە لە مەیی چـیترمان نیە، ئێرە مەیخانیە جگە لەوەی بۆم باسـکری چـیترمان نیە، یان ئێوە بە هەڵە هاتوونەتە ئێرە؟

دوای دانیشـــتم پێمگوت: دەزانم تۆ دڵێکی پاکت هەیە و ئەوەندە خراپ نیت کە باسی دەکەیت، و دەتەوێ وا نیشانی بدەیت.

سەیرێکی کردم و درێژەم پێدا: دەشزانم شتێك هەیە بێگەردی ژیانتی تێکداوە و پاڵی ناویت بۆ ئەو حاڵەی ئێستات، تۆش باش دەزانیت چارەسەری ئەو حاڵەت هیچ پەیوەندیەکی نیە بەوەی ئێستا دەینۆشی.

بە کەم بایەخەوە گوتی: ئینجا سوودی ئەو زانیاری و زانینەت چیە؟ هیچ شتێکی بۆ گەڕاندمەوە؟ ئایا هیچ سوودێکم لێی بینی؟

پێمگوت: بەڵێ هاوڕێ حاڵت باش دەبێت گەر گوێم لێبگریت و تۆزێك ئاوەزت بەکاربێنی ، بۆچی سبەی دوای نیوەڕۆ لە ماڵی شێخ صەفا سەردانیمان ناکەیت؟ بێگومان دەیناسی!

گوتی: بەڵێ دەیناســـم، بەڵام نامەوێت ســـەردانی کەس بکەم و هاوبەشـــی و هاوڕێیەتی کەس بکەم، .. هەموویان بۆ ســـوودی کەســـی خۆیان هەوڵەدەن، وەکوو پێغەمبەر و پیاوچـــاکان خۆیان نیشـــان دەدەن، کاتێ ئەوەی ویســـتیان دە ستیان کەوت دەگۆڕێن بۆ شەیتان... هیچ کەس شایەنی هاوڕێیەتیکردن نیە جگە لەو کوپە! دواتر من ناتناسم بۆ ئەوەی سەردانت بکەم ، چوزانم هیچت لێم دەوێت؟!

پێمگوت: بەو شێوە نیە هاوڕێ، پێم باوەڕ بکە... باشە چی دەڵێیت ئەگەر من ســـەردانت بکەم گەر تۆش ناتەوێت بێیت، تاقیبکەوە هیچ زیان ناکەیت، لەوانەیە شتێکی شایەن بە کێشەکەت بدۆزیتەوە.

بە دەنگێکی بەرز و زبر گوتی: پێمگوتی ســـەردانی کەس ناکەم و نامەوێ کەسیش سەردانم بکات..

لە شوێنەکەی خۆی هەڵساو لە شوێنێکیتر دانیشت.

خەڵکی وێکرا ڕووی خۆیان وەرگێرا، وەکوو کەسێکی سنووربەزێن سەیریان دەکردم، وا گومانیان دەبرد خۆشی ئەو شەوە یان لێ تێکدەدەم، ئەو هەڵوێستەی ئەو پیاوەش ئەو گومانەی ئەوانی بەڕاست گەڕاند، تووشی شەرمەزاریەکی گەورە بووم و پێویست بوو ئەو ناوە جێبێڵم.

هەندێ پارەم بە گەنجەکە دایەوە تا بە خاوەن مەیخانەکەی بدات و چۆن هاتین هەر بەو ڕێگایەش گەڕاینەوە.

ئەو خەڵکە چەند بێ ئاگا و هەژارن، شارەزای شەڕی "بوون" نین، تا ئەو کاتەی هەموو تەمەنیان خەرج دەکەن بێ ئەوەی هیچ دەستبخەن، .. ڕادەکەن لەو بەندایەتیەی بۆی درووستکراون، بە بەندایەتی نەفس و شەیتان تاقیدەکرێنەوە... بوونی خۆیان نەدۆزیوەتەوە چوون ئەوان لە ناو هیچ و نەبووندا بە دوای بوونی خۆیان دەگەڕێن، نەخۆشکەوتن و بە دەرد چارەی خۆیان دەکەن! خۆزگە ئاوەزیان دەکار دەبرد! وەکوو ئەوەی زوبانی حاڵیان بڵێت:

وازلە لۆمەکردنم بێنە، چوون لۆمەکردن هەڵخەڵەتاندنە

وەرە تیمارم بکە بەوەی کە پیشتر دەرد بوو.

لە ڕێگەی گەڕانەوەمان بۆماڵەوە گەنجەکە گوتی: قوربان چیت لێی دەویست ؟ خۆ ئەو کەسێکی دەرکراو لە ڕەحمەتی خودا بوو.

پێمگوت: ڕۆڵە هەموو مەیخۆرێك سەرانگێز نیە، لەناو ئەوانەدا خەڵکێکی زۆر باش هەیە...

ڕێگری ئەوان تەنێ ئەوەیە کە هیچ مامۆستا و چاوساغێکیان نیە، ڕاستکردنەوەی ئەوانە ئەرکی هەمووما نە، چـــاکترینی خەڵکی ئەوانەن کە بانگەوازی بۆ لای پەروەردگار دەکەن ئایینەکەی ئەو لای خەڵکی خۆشەویست دەکەن.

لەسـەر پزیشـك پێویسـتە لە تیمارکردنی برین و تەداویکردنی نەخۆش بێزار نەبێت، چوزانی ئەوەی تۆ ئێستا بە خراپە دەیبینی و پەلارت لێیدا ناگەڕێتەوە و بەرەو باشـی ناچـێت و ڕوو دەکاتە خودا و خوداش لێی قەبوڵ دەکات، دەرگا کراوەیە و کەسیش ڕێگری لە دەرگادان لێناکرێت.

ئەمان گومانی خەراپ بە گوناهباران مەبە و خۆت لەوان بە باشتر مەزانە، چوون ئەوە لە فێلەکانی نەفسە و بە هۆیەوە دەخەڵەتێی.

تەنانەت پەروەردگار خۆی لەوان دوور نەخستۆتەوە، بەڵکوو ئەمانی بۆ لای خۆی پاڵداوە و بە بەندەی خۆی پەسنی کردوون، پلەی بەندایەتیش گەورەترین پلەیە بەندە بەدەسـتی بهێنێت، هەروەکوو دەفەرمووێ: ( قل یاعبادي الذین اسـرفوا علی انفسـهم لا تقنطوا من رحمة الله) دەرگای ماڵەکە کراوەیە و هیچ کەسـێك لە نهۆمی خوارەوە نیە هەروەکوو بەو شـێوەیە باسـتکرد، چـوومە ژوورەوەو دوای ماوەیەکی کەم جەنابی شـێخ بە ڕووێکی خۆش و ڕۆشـن هات و پرسـیاری کرد: ئەو هەموو ماوەیە لە کوێ بووی جەنابی شێخمان ؟

وەڵامدایەوە: بۆ کارێك لە دەورووبەری ئەو ناوچەیە بووم.

قسـە و باسمان کردەوە دەربارەی" مالیك" ئەو گەنجەی لە سـەردانیەکانم هاوڕێیەتی دەکردم، بۆی باسکردم گەنجێکی بە ڕەوشت و ژیرە، لەوەتەی باوکی کۆچـی دوایی کردووە کەس خراپەی لێ نەبینیوە، مالیك کوڕی ڕاوچـیەکی هەژاری شارۆچکەکەمان بوو. ڕاوچیەکە لە تاڤگەیەکی باشووری" ئەسوان" نغرۆ

بوو، خنکا و دوای خۆی هاوسـەر و ئەو کوڕەی جێهێشت، "شـێخ صـەفا" سەرپەرشتیاری دەکرد تا دایکیشی بە هۆی نەخۆشی سیلەوە مرد، ئەو کات مالیك تەمەنی شەش ساڵ بوو، هیچ خزمێکی نزیکی نەبوو بۆی بگەڕێتەوە، بۆیە جەنابی شـێخ لە خۆیگرت و ئەرکی پەروەردەکردنی و فێرکردنی ئەوی گرتە ئەستۆ، تا تەمەنی گەیشتە بیست ساڵ و بوویە گەنجێکی شارەزا و چاکەکار.

جەنابی شێخ صەفا ئیزنی خواست بچێت تۆزێ بشوو بدات و بخەوێ، منیش کەمێ پشـووم وەرگرت تا بۆ وتنەوەی وانەکانی بەیانی ئامادەبم، تا دەهات ژمارەی فێرخوازان زیادی دەکرد، ڕۆژێك یەکێك بۆ ژەمی چێشتێ بانگی کردم.. کەسێکی سادەی خەڵکی لادێ بوو، شـەرمم کرد داواکەی ڕەتبکەمەوە، بەدەم داواکەی چـووم و مالیکیشـم لەگەڵ خۆم برد. پیاوەکە زۆر پەسـنی دەدام و سـتایشـی دەکردم و منیش دوعای خێرم بۆ ماڵ و منداڵی کرد، تێبینیم کرد ئەوجارە مالیك بەو دانیشتنە لە جارەکانی پێشتر دڵخۆشتربوو.

کاتێك لای پیاوەکە دەرچووین پرسیارم دەربارەی ئەو دڵخۆشیەی لێکرد، گوتی: قوربان هیچ نیە، نەمویست زۆر پێداگیری لێ بکەم بەڵام دەمزانی شتێك هەیە.

دوای پێش نیوەڕۆ مالیك هاتە لام، من لە ژوورەکەی خۆم بووم لە ماڵی "شـێخ صـەفا"، پێی گوتم پیاوێك هاتووە داوای بینینی تۆ دەکات! کاتێ هاتە ژوورە بینیم هەمان ئەو پیاوە بوو کە لە مەیخانەکە گفتوگۆمان کرد و ڕەتیکردینەوە، کاتێ سەیرم کرد بینیم لە نێوچـاوانیدا نیشـانەی شـەرمەزاری خەجاڵەتی پێوە دیارە، مینا بۆ ئەوە هاتبێت داوای لێبووردن لەو ڕەفتارەی ئەو شەوەی بکات، بۆ ئەوەی شـەرمەزاری و خەجاڵەتەکەی کەم بکەمەوە، بە ڕوویخۆش و گەرمیەوە

بەخێرهاتنم کرد: بەخێربێی سەرچاوانم هاوڕێی باشم، چەند دڵخۆشم جارێکیتر بە دەتبینم! وا گومان دەبەم دوێنێ شەو بە ئامۆژگاری بێزارم کردی، لێممەگرە ئەو ئامۆژگاریانەم لە سینەپاکی و خەمخۆریەوە بوو.

گوتی: نا، بەڵکوو من هەڵە بووم بەرامبەرت، حەز ناکەم ڕەفتارێکی ئاوا بەرامبەر کەس بنوێنم، هاتووم بە دڵ داوای لێبووردن بکەم و پەشیمانم، داوای لێبووردنم قەبوڵ بکە گەر دەتەوێ، ئەگەر نا دەچینە ئەو شوێنە و بەرچاوی خەڵکی داوای لێبووردنت لێدەکەم، ئەوەی پاڵی پێوەناوم بێمە لات ئەوەیەتا ئێستا لە نێوان من هیچ کەس ناخۆشی و زبری و زویربوون ڕووینەداوە.

بێگومان دڵە پاکەکەیی و لایەنی باشەی ناواخنی وێنەی پاکیی و بێگەردی ئەوی لە یەکەم ساتەوەختی بینینی نیشاندام، هاتبوو بۆ داوای لێبووردن، گریمانەکەم بەڕاستگەڕا کاتێ ئەوم بۆ گفتوگۆ لە نێوان هەمووان‌دا هەڵبژارد.

پێمگوت: هیچ براکەم، تۆ هیچ ڕەفتارێکی خەراپت ئەنجامنەداوە، بەڵکوو دەبێ من داوای لێبووردنت لێ بکەم چوون تەنیاییەکەتم لێ تێکدایت.. ڕۆڵە مالیك برۆ پێیان بڵێ: فنجانێك قاوەمان بۆ میوانە خۆشەویستەکەمان درووست بکەم.

دواتر پێمگوت: من دڵخۆشم بەوەی روویدا، لەوانەیە ئەمە ببێتە سەرەتای هاوڕێیەتیەکی ڕاستەقینە لە نێوان من و تۆ ئایا تۆش لەگەڵ هاوڕای؟

گوتی: تکایە .. نامەوێت خۆم بخزێنمە ژیانی ئەوانیتردا، .. ئەوەی بەهۆی ئەوانەوە تووشی بووم بەسمە، دەمەوێ بەو شێوەیە بە تەنێ بم، .. بەردەوام کار بەو پەندە دەکەم کە دەڵێ: ئەوانیتر خراپ و نغرۆی شەڕن، دەمەوێ ژیانم بە ئاشتی ببمە سەر). ئایا مەبەستەکەم ڕوونە؟

گوتم: چۆنت دەوێ با وابێت بەڕێزم، لەسەر هیچ شتێك ناچارت ناکەم.

مالیك قاوەكەی هێنا و ویســـتم بە هەرشـــێوەیەك بێت دەرگای گفتوگۆی لەگەڵ بكەمەوە و پێم بڵێت بە هۆی چـــیەوەیە ئازار دەچـــێژێت! لەوانەیە بتوانم ئامۆژگاریەكی باشی بكەم، بەڵام هەرزوو مۆڵەتی ڕۆیشتنی خواست، مینا كارێكی بە پەلەی هەبێت و بچێت بە دوایەوە.

پێمگوت: دەمەوێ فنجانە قاوەیەكم پێشكەش بكەیت لەماڵەكەی خۆت یان هەر شوێنێكی تری تۆ بتەوێ، هەروەكوو چۆن پێشوازییم كردیت، تۆ دەزانیت ئێرە ماڵی من نیە.

گوتی: گەر داوەتم كردی وازم لێ دێنیت خۆم و كارەكانم تەنها بین؟ پێم گوت: بەڵێ. باشە با دیدارمان سبەی دوای عەسر لە ماڵی ئێمە بێت. دواتر ڕۆیشت.

پرسیارم لە مالێك كرد و پێمگوت : چیرۆكی ئەو پیاوە چیە، گوتی: ئەو پیاوە یەكێكە لەوانەی كە نغرۆی خۆشـــیی و بەخشـــشـــەكانی خودا بوو، دونیا بەڕووی خۆش و بزە و پێكەنینەوە ڕووی لەو پیاوە كردبوو، لە باوانیەوە ئەو موڵك و سامانەی بۆ بەجێمابوو، ئافرەتێكی جوان و قەشەنگی مینا ئافرەتانی بەهەشتی هەبوو، پێكەوە لە خۆشی و كامەرانی دەژیان، وەكوو ئەوەی لە جیهانی خەیاڵدا بن، كەشخەترین جلیان دەپۆشیی و بەچێژترین خواردنیان نۆش دەكرد..

دایكێكی هەبوو لەگەڵیان دەژیا، ئەان بەچـــی ڕازی بووبان ئەویش ڕازی دەبوو، خۆشـــڕەفتاربوو لەگەڵیان و مینا باشـــترین دایك بوو بۆیان. دونیای ئەو پیاوە بریتی بوو لە دایك و هاوســـەرەكەی، هەموویان لە كامەرانی و خۆشـــی و ئارامی دەژیان، بەڵام ماڵوێران! بەردەوامبوونی حاڵی مرۆ لە ئاست و پلەیەكدا مەحاڵە،

پاك و بێگەردی لێڵی و خەوشــی بەدوواداديێت، لەناكاودا هاوســەرەكەی مرد، كوڵەگەيەكی داتەپی و كۆشــكەكەی خاپووربوو. ســاڵێكی پێنەچــوو دايكيشــی كۆچــی دوايی كرد، حاڵ و ژيانی گۆڕا و دونيای خۆشــيەكانی لیٚ تەنگ و تاريك بوو، دەيويست ئەو ديمەنە ئازاربەخشانەی لەياد نەمێنن، ڕووی كردە هەڵگرتنی پێك و مەيخواردنەوە بە هيوای ئەوەی ناخۆشــيەكەی لەســەر نەمێنیٚ! ماڵەكەی بنی هات و لە خەڵكی دووركەوتەوە، دواتر گەيشــتە ئەو شــوێنەی كە ئێســتا دەيبينی، ئاگری بەزەيی دەخاتە جەرگی هەركەس كە دەيبينیٚ.

ئەوەبوو چــيرۆكی خوگرتنی ئەو مەيخۆرە پەشــيمانەی كە ڕۆژانە ســەتانجار دەچوويە مەيخانە و پەشيمان دەبوويەوە، تا وای لێهات بوويە بابەتێكی لاوەكی و پشتگوێخراو، چەنديتر لە گۆشە پشتگوێخراوەكانن خەڵكيش لێيان بێئاگان!

چيرۆكی هەموويان دووبارەيە و دەكەونە هەمان چاڵەوە، بەڕاستی بەختەوەر ئەو كەسەيە كە پەند لەوانيتر وەردەگرێت، وەلیٚ بەڕاستی ئەوە ڕوونادات و ئاوەزيان ناخەنگەڕ.

قوربان دەتوانم نهێنيەكن لا بدركێنم، ئەوە ماليك بوو بەو شێوەيە هاتەگۆ..

پێمگوت: فەرموو ڕۆڵە..

لەڕاســتيدا قوربان من دەمەویٚ هاوســەرگيری لەگەڵ كچــی ئەو پياوە بكەم د دوێنیٚ داوەتی كردين، بەراستی ئەو پياوە كەسێكی باش و دڵنيايە..

بە پێكەنينەوە قســەكانيم پچــڕاند! : هەســتم كرد كە شــتێك هەيە و تۆ لێم دەشاريتەوە ماليك..

بۆچــی ئەوكات ڕاســتيت پێنەوتم كە پرســيارم لێكرديت، خۆ ئەم ئەكات لە ماڵی ئەو پياوە بووين، دڵخۆشيت جۆريك بوو سەرەنجی هەمووانی ڕادەكێشا؟

- بەڕاستی قوربان شەرمم لێت دەکرد.

هەر چۆنێك بێت ئینشائەڵلا لەگەڵیان گفتوگۆ دەکەم و هەواڵی داواکەی تۆشی پێدەگەیەنم، .. خێر دەبێ ئینشائەڵلا.

- بارەکەڵا قوربان..

- بەڵام قوربان هەندێ دەســـتەواژەی مەجازی لە هەندێك پەرتووکی تەســـەوفدا بەکاردەهێنرێ نازانم مانایان چـــیە، یان ئەوانەی بەکاری دەهێنن بەداخەوە نازانن ماناشـــی چـــیە، بەنموونە وشـــەکانی وەك: (مەی، کاسەی مەی و هاوشێوەی ئەوانە)

- گوتم: ڕۆڵە ئەو وشـتەیان بە کارهێناوە تاوەکوو خەڵکی جگە لەوان ئەو وشانە دەکار نەبەن، ..

وەڵێ ئەو وشانە مجازن بۆ شتگەلی تر بەکار دهێنرێت و مەبەست لێیان مانا ڕاســتەقینەکەی نیە، بۆ نوونە: وشــەی مەی و مەیگێر و هاوشــێوەکانیان، مەبەســت لێی چــتێکی مەعنەویە و بەرهەمی زانینی نهێنیەکان و بینینی جیهانی نووره.

تەنانەت یەکێکیان دەیگوت: " مەی لە نێو ڕوحدایە نەك مەیخانە" واتە مەیی ڕوح و مەعنەویەت ئەو مەیەی مەیخانە نیە، ئەو مەیخانەیە نیە کە شـــوێنی خواردنەوەی مەیە.

- بەڵێ قوربان، زۆرباشە، دەربارەی شەریعەت و حەقیقەت زۆر قسەوباس دەکرێ دەڵێن: شـــەریعەت لە حەقیقەت جوازە، جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، تۆ لەبارەیانەوە چی دەفەرمووی؟

گوتم: شـەریعەت بریتیە لە فرمانەکای ئایینی پیرۆز، هەر ئەوەیە کە بە هۆی نیگاوە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر(د.خ) وەکوو نوێژ و ڕۆژوو و دوورکەوتنەو لە قەدەخەکراوەکان.

بەڵام حەقیقەت بەرهەمی کارکردنە بە فرمانەکانی شـــەریعەت، واتا دوورکەوتنەوە لە قەدەخەکراوەکان و ئەنجامدانی فرمانپێراوەکان، هەموو حەقیقەتێك دەچێتە ناو شەریعەت بەڵام هەموو شەریعەتێك حەقیقەت نیە.

- زۆرباشە..، ئەی جیاوازی حاڵ و پێگە(مەقام) چیە قوربان؟

حاڵ بەرووبوومی زانستە، گەر بەردەوام بوو دەبێتە پێگە و پلە و (مەقام)، گەر ئەوەش تەواوبوو دەبێتە حاڵ...

بۆ نموونە گەر مرۆڤ پەرتووکی تەســـەوفی خوێندەوە، ئەو پەرتووکانەی دەربارەی تەســـەوف و زوهد و ژیانی خواپەرســـتان و چـۆنیەتی ژیانیان، خۆنەویستیان چۆن بووە بۆ دونیا و چۆن ڕوویان کردۆتە دواڕۆژ و کارکردن پێی، ئەمە وا دەکات پاڵنەرێك لە بوونی کەســەکەدا درووســت بێت و وای لێدەکات ڕوو لە خودا بکات و واز لە قەدەخەکراوەکان بێنێت و دونیا نەپەرســتێت، ئەمەی بە ئاشــکرا لە ئەندامەکانی جەســتەی دەبینرێ و ڕووبەڕووی وەســوەســەی شــەیتان و ئەوانیتریش دەبێتەوە، گەر جوڵا و کەوتە لەرزین ئەوە حاڵە، ئەگەر بەردەوام بوو و نەکەوتە ژێرکاریگەری

شـەیتان و وەسـوەسـە و بەردەوام پتەوبوو ئەوە "مەقام و پایە"یە، بۆیە پێشەوا غەزالی دەفەرمووێت: " زانست حاڵ بەرهەم دێنێت و حاڵیش مەقام "

- بارەکەڵڵا قوربان، خودا زانسـتت فرەکات، .. ئایا شـتیترت لە من دەوێ؟ دەچـم ئەو وەڵامانەی جەنابتان دەنووسـم نەوەکوو بیرم بچێتەوە.
- نەخێر، بارەکەڵڵا ڕۆڵە.

دوای عەسری ڕۆژی دواتر چوومە لای ئەو پیاوەی لە مەیخانەکە بینیمان، لە هەمان ئەو ڕێکەوتەی لەسـەری پێکهاتبووین، لە دەرگامدا، هاوڕێکەم دەرگای کردەوە.. لە ڕاسـتیدا ئەوجار بە گەرم و گوڕی بەخێرهاتنی کردم، گوتی: دوێنێ زۆرم بیر لە تۆ کردەوە، گەیشـتمە ئەوەی هیچ ڕێگریەك نیە لەوەی ببینە هاوڕێ جەنابی دەروێش.

گوتم: ئەوە زۆرباشـە، بەڵام من لە یەکەم دیدارم لەگەڵ تۆم بە هاوڕێی خۆم هەژمار کردووە، ئێستا کە بووینەتە هاوڕێ دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم: چ شتێك ئازارت دەدات هاوڕێی خۆشـەویسـت؟ باوەڕم پێبکە دەزانم شـتێك وایکردووە ژیانت تێکبچێ و بەرەو ئاراسـەیەك بچی کە لەگەڵ سروشـتی خۆت ناگونجێ– ببورە– وەکوو ئەو بێ ئاگاییە، ئایا وانیە؟

دوای ئەوەی لە شوێنی خۆی دانیشت و هەناسەیەکی خەماویی تێکەڵ بە گەرمی دڵێکی گڕ گرتووی هەڵکێشاو و گوتی: ڕاستەکەی بەڕاسـتی وایە، ڕووداوگەلێکی زۆرم بەسەر هاتوون وەکوو مرۆڤێکی وێرانبوویان لێکردووم، منیان پەلـکێشی

دۆزەخی بزربوونی خۆم کردووە، گرنگی بە هیچ نادەم، سکالای خەم و پەژارەکانم دەبەمە لای کاسەی مەی، بە هۆی ئەوەوە لە کەتوارە خەماویەکەم رادەکەم.

- بەڵێ... گوێبگرە هاورێی خۆشەویست، دەزانم چیت بەسەرهاتووە، هەر بۆیە حەزەکەم شتێکت پێبڵێم ئەگەر....
- تکایە، .. هیچ مەڵێ... هەموو ئەوەی دەتەوێ بیڵێی و بۆمی باسبکەیت هەستی پێدەکەم و ئاگاداریمە، دەیانجار پێمگوتراوە....

ئایا گومان دەبەیت دەتوانم لەم خەم و ناخۆشیەی پێیەوە دەناڵێنم بەو ڕەچەتە جادوویانەت ڕزگارم بێت؟ ئێوەی بانگخواز لە نێو ناخۆشیەکانی ئێمە ناژین، هەست بە ئازارەکانی خەڵکی ناکەن، ئەو وشانەی بەرگوێیان دەدەن دەبنە هۆی بێزاری و بارگرانی و گوێچکەکان توانای هەڵگرتنیانی نەماوە... کارەسات و ناخۆشیەکانی ژیانم لە ئامۆژگاریەکانتان گەورەترن، ئەو ئامۆژگاریانەی گوێچکەکانیان پڕ کردووە و خەریکە لە چەند پاتەی دەخنکێت .

گوتم: بەڵێ... گەر بابەتەکە ئەوهایە ئێستا تێڕوانینت بۆ ژیان چیە؟! لە چە شتنی ئەو ئازار و دانیشتن لەو کۆڕە ڕوخێنەرانە بەردەوام دەبێت؟ سوودی مرۆڤ چیە گەر لە ناوەوە ڕووخاوبێت و بێ ئامانج بژی؟

ماوەیەك بێ دەنگ بوو، نازانم بۆچی وام بەباش زانی کە گفتوگۆیەکەم لەگەڵی بە کۆتابێنم، حاڵی قەبوڵی زیاتری نەدەکرد..

پێمگوت: بە جێتدێڵم بێ ئەوە بیر لە گۆڕی ژیانت بکەیتەوە، .. دوور لە کارکردن بەو ئامۆژگاریانەی کە گوێچەکان پڕ دەکات- بە دەربڕینی تۆ-.

پیاوەکەم جێهێشت و گەڕامەوەماڵەوە، شێخ صەفا لە ڕارەوەکە چاوەڕێی دەکردم.. سڵاوی کرد و هەواڵی پێدام کە خۆی و مورید و منداڵەکانی هەموو ساڵ بە بۆنەی یادی شەوڕەوی پێغەمبەر (د.خ) هەڵدەستن بە سازدانی ئاهەنگ، هەروەها گەورە پیاوانی مەغریب لە ئالوبەیتی پێغەمبەر (د.خ) داوەت کراون، ئەمە دەبێتە هوی یەکت رناسین و درووستبوونی پەیوەندی لە نێوان ئەوان و هاوکوفەکانیان لە ڕۆژهەلات درووست دەبێت، خێردار و پڕ فەڕ دەبێت.

داوای لێکردم لەو ئاهەنگەدا یارمەتیان بدەم تاوەکوو ئاهەنگەکە بە جوانترین شێوە بەڕێوەبچێت و جێگای ڕەزامەندی میوانەکان بێت، هەروەها کاتێکی شیان بۆ پێشکەشکردنی وتارێك بۆ منیش تەخان کردبوو، ئاهەنگەکە چەند ڕۆژێکی کەمی مابوو، ئەو ئاهەنگە دەبووە کۆتاییەکی جوان و ڕازاوە، چوون منیش لە کۆتایی تەواوکردنی پەرتووکەکە بووم، چەند ڕۆژێکی کەمم مابوو لادێکە جێبێلم، ڕازیبووم و جەنابی شێخ زۆر پێداگیر بوو لەوەی ئەو کارە بە گرنگیەوە سەیر بکەین.

دوای دوو ڕۆژ هاوڕێیە خەمبار و کارەستبارەکەم بینی لە ناو خەڵکەکەدایە و هاتووە بۆ گوێگرتنی وانەکان، بەو کاتەی بەیانی ! تووشی هێدمە بووبووم، وام گومان برد دوای دوایین دانیشتنمان بەخۆیدا چۆتەوە و بیری لە حاڵ و ژیانی خۆی کردۆتەوە، بەڵام بە هەڵوێستەکەی زۆر سەرمسوڕما، چوون بێ ئەوەی هیچ گفتوگۆیەك لە نێوانمان ڕوویدات هەستا و ڕۆیی.

بەڕاستی نەمزانی چۆن ئەو هەڵوێستەی ڕاڤە بکەم، ئەوەی بۆم بەردەرکەوت دوو هەڵوێستی دژیەك بوو، لەوانەیە بیری لەو گفتوگۆیەی نێوانمان کردبێتەوە، لەوانەشە ئەمە سەرەتای گۆڕان و ئاماژەی گەڕانەوە بێت.

ئەوەم بۆ ساغبوویەوە کاتێك بە ئەنقەست سەرێکی مەیخانمدا و لەوێ نەمبینی! کاتێك پرسیاری ئەوم کرد گوتیان نەهاتووە.

گومان دەبەم پێویستی بە دانیشتنێکی تر هەیە.. لەوانەیە لەگەڵ کەسێکتر گفتوگۆ بکات و ئامۆژگاری بکرێ و ڕێنمونی بکرێت، بەڵام من ئەو کەسەی شایستەی ئەو کارە نیمە، لەوانەیە کەسیچکیتر بێت و خاوەن ڕێگا و چارەسەری کاریگەربێت، دەبێ ئەو کەسە کێ بێت؟

کاتێك ئەوەم بۆ شێخ صەفا باسکرد و تەواوی بەسەرهاتەکەم بۆیگێڕایەوە، پێمگوت ئەو کەسە پێویستی بە دەستی یارمەتی هەیە، پێویستی بە دەستێك هەیە لە چاڵی گوناه و بیابانی سەرگەردانی و قوڵایی خەم و پەژارە دەریبهێنێ و بیباتە نێو ژیانی پاك و بێگەردی.

بێگومان بنچە و پێکهاتەی پیاوەکە باش و پاکە، تەنێ ئەو کارەساتەی بەسەردا هاتووە لە هێزی خۆی گەورەترە، بێتوانایی و دەستەوەستانی دەرکەوتووە، کێ دەزانێ؟ لەوانەیە نزیك بێت لە دەرگا و گەر بە نیازەوە لە دەرگا بدات لێیبکرێتەوە، لەوانیە ئێستا کاتی گەڕانەوەی بێت، هەندێك گوناه هەیە دەبێتە هۆکاری گەڕانەوە و ملکەچی بەندە.

هەر زوو شێخ صەفا ڕەزامەندی نیشاندا و شەوی دواتر لە گفتوگۆکەم لەگەڵی چووە سەردانی ئەو، کە گەڕایەوە پێیڕاگەیاندم کە لەگەڵ پیاوەکە دانیشتووە، وا دەردەکەوت کە هیچ گفتوگۆیەك لە نێوانیاندا ڕوووینەدابێت، دانیشتنەکە بێ

ئەنجام کۆتایی هاتبێت، لەوانەیە لەبەر شکۆ و شەرمی شێخ هیچی نەدرکاندبێت و دەرگای بەڕووی نهێنیەکانیدا والآ نەکردبێت، یان نەویســـتووە خەم پەژارەی پەنگخواردووی ناخی هەڵڕێژێت.

## (٦)

ڕۆژێك مابوو بۆ ئاهەنگی ئیسراو میعراج، شێخ صەفا گرنگی زۆر و بێ پایانی بەو یادە دەدا ئەمەش لەبەر خاوەن یادەکە بوو( د.خ)، جەنابی شـــێخ فرمانیدا ئاهەنگەکە بە شـێوەیەك گونجا و شـایستـەبێت بەو میوانە ئازیزانەی مەغریب، چوون ئەو میوانانە لادێکە و ناوچەکەمان بەرەکەتدار دەکەن.

جەنابی شـــێخ لە هەموو ڕێکخســـتنەکان، بچـووك یان گەورە بۆچـوونی خۆی دەردەبڕی، کوچە و کۆڵان و شەقامەکان ڕازێنرانەوە، لادێ جلی جەژنی پۆشی و خەڵکی لە خۆشیدا نغرۆ بووخۆشی لە ڕووی هەمووان دەبینرا، ئەم خۆشیەش لە یارمەتیدان و هاریکاری یەکتر و ئامادەکاریی بۆ ئاهەنگەکە خۆی دەنواند، بۆچی نا.. چوون شێخ صەفا وەکوو باوکێکی بەسۆز بوو بۆ هەمووان، ئەو ڕێنیشاندەر و پەروەردەکار و مامۆســـتا و ئامۆژگاریکەر بوو، کاریگەریی و شـــوێندەســـتی بەسەر خەڵکی لادێ جێهێشتووە.

ســـەیر نیە لە ناو ئەو خەڵکی خەریکی ئامادەکاری ئاهەنگەکە بوون و هیچ کەمتەرخەمیان نەنواند، ئەو پیاوەشـــی تێدابێت کە ڕێبواری مەیخانەکانە، ئەو پیاوەی بە ئامۆژگاریەکانم تووڕە دەبوو، ئەو پیاوەی لە ناخۆشیی و تەنەژەکانی ژیانی ڕۆژی دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەو دەرفەتەی لە دەســـت نەدا لەگەڵ خەڵکی لادێکە خەریکی ڕێکخســـتنی ئا هەنگە کە بوو، تەواو توا نای خۆی دەخســـتە گەڕ، لەو لادێیە پیرۆزە و جوانەی ئێمە خەڵکی لە گەڵ جیاوازی تێڕوانینیان، هەرچـەند ناخۆشـیان لە نێوان هەبێت، یادی خۆشـی و ناخۆشـی هەموویان کۆدەکاتەوە، گیانی هاوکاری لە خوێنیاندا هاتووچۆ دەکات، هەرچی

ڕوویدات هەریەکەیان تەواوی ئەوەی لە توانایدایە پێشکەشی دەکات، ئافرەتان و پیاوان، گەورە و بچـووك، هەموویان وەکوو شـانەی هەنگ وان لە یارمەتیدانی یەکتر.

پیاوەکەم بە بزەوە ڕاگرت و بە گوێمدا چرپاند: بەخێربێی هاوڕێی خۆشەویست، چـەند دڵخۆشـم بە ئامادەبوونت لێرەدا، لە نێوان خەڵکی لادێ و دراوسـێکانت، ئایا بەردەوام سەردانی کۆڕی صۆفیە هەژارەکان و ئاهەنگەکانیان دەکەیت؟

بەسـەری ئاماژەی بۆ کردم و بە دەنگێکی نزمەوە گوتی: لەسـەر بەشداریکردنی ئاهەنگەکان ڕژد دەبم، بە تایبەت گەر کەسـانی بەڕێز و ڕێزدار بەشـداری بکەن، لەوەتەی بچووك بووین لادێکەمان هەموو ساڵێ ئاهەنگی لەو شێوەیە ساز دەکات و میوانان لە هەموو شـوێنێك دێن، وەلێ جەنابی شـێخ بە هۆی بەشـداری تۆوە ئەو کەڕەتە جوایەزە ! لەبارەی تۆوە لە قوتابیانەوە گوێبیسـتی پەسـنی تۆ بوومە، باسی زانست و بالآیی ڕەوشتت دەکەن.

لە بەرخۆمەوە گوتم: گومانەکەم دەربارەی ئەو پیاوە هەڵە نەبووە، کاتێ پێموابوو لەوانیتر جیاوازە و لە شـوێنێکی هەڵە دانیشـتووە کە شـوێنی ئەو نیە، ئەو مەیخانە ! بێگومان بەبێ ویسـتی خۆی ڕێگاکەی ون کردووە، ئەو تەنها ئاتاجی کەسـێك بوو ناخۆشـیی و باگرانیەکەی لەسـەر سـووك بکات و قوڵی میهرەبانی بخاتەسەر شانی و ئاماژەی ڕێی ڕاستی بۆ بکات..

ئەو وتەیەی لە ئاوەزمدا دەخولایەوە، وایکرد دەروونم بۆی بجۆشـێ و بەزەییم پێدا بێتەوە و تکای گەڕانەوەی بۆ بکەم. سۆزم بۆی نواند و دەرگای قسەکردنم لەگەڵدا والآ کرد و بە گوێمدا چـرپاند: ئەمڕۆ ڕووخسـارت دەگەشـێتەوە و شوێنەواری کامەرانیت پێوە دیارە ! هیچ هەیە بۆمی باس بکەیت؟

گوتی: دوای ئەوەی شـێخ صـەفا سـەردانیکردم، لەوانەیە تۆ هۆکاری ئەوە بوو‌بیت، لەگەڵ خۆم دانیشتم، ئەگەرچی جەنابی شێخ لەگەڵمدا قسەی نەکرد، باشـتر بڵێم دەرفەتی ئەو باسـەم نەدا، وەلێ لە چـاوانیدا باشـترین ئامۆژگاریم وەرگرت، دیدگام بەرامبەر ژیان و خۆگونجان تیایدا گۆڕا،

لە هەموو ئەو سـاتانەی کە لاوازیمی تێدا نواندووە و پێویسـتی نەکردووە بەو شێوەیە بێت...

لەوانەیە ئەو کاتەی تووشـی ئەو کارەساتەبووم ئێوەم بینیبووایە نەدەکەوتمە نێو ئەو هەموو هەڵانە، بەڵام قەدەری خودا وابوو، بەڵام سـەردانی جەنابی شـێخ وەکوو کێشانبوو بە هەنیەم و ڕایچڵەکاندم، لە خەوی بێئاگایی وەخەبەریهێنام و لە چـەڵکانی سـەرگەردانی دەریهێنام، بێگومان تەمەن کورتە و دەمەوێ ئەوەی ماوە ڕابردوومی پێ چـاك بکەم، داوام بۆ بکە خودا ڕاگیر و دامەزراوم بکات و دەستم بگرێت بۆ لای خۆی..

چەندە جوانە ئەو وشانەی کە لە دڵە ڕاستگۆکەتەوە دەرچوون و نماینەدەی خەم و ئازارە کانتە و ڕێگای ڕزگار بوونت بۆ والا دە کات، چـەندە بە سـوودە ئامۆژگاریکەرەکەت خۆت بیت. هەتا بانگخوازی چاکە مابێت و بەرووبوومەکەشی ساخ و تەندروست دەبێت، ئای لەو موژدە و سەرکەوتنەت.

وەرە دەرگا کراوەیە و پەروەردگار لێبووردە و ڕازییە بە گەڕانەوەی بەندەکانی، بەڵکوو لێیانخۆشدەبێت و بە باشترین و بالاترین شێوە پاداشتیان دەکات.

وەرە دەستی پەشیمانی هەڵبڕە و ڕۆندکی چاوانت بنێرە و ئارامیی شەو و تیپی دەمە و نیوەڕۆ بقۆزەوە و کرنۆشی قوڵ ببە و نزیکبەوە..

گۆشەگیری.. گۆشەگیری، لە گۆشەگیریدا ئاسوودەیی هەیە، دەست بەسەر سەری هەتیو دابێنە دڵت نەرم دەبێت و دەگەیت بە ئامانجەکەت، هەمیشە ڕۆژی ماڵئاواییت لەبیربێت، ئەو دەمەی دەکەویتە گیانەلاّ بیروهۆش نامێنێت و لقی تەمەن دەشکێت و مرۆ بە کفن دەپێچرێت و باش دەیپۆشن، ئای چەند تەنیاییە ئەو کەسەی کە کردەوەکانی دڵنەوای ناکەن! ئای چەندە ئاتاجە ئەو کەسەی کە تێشووی بۆ ڕۆژی کۆچی دانەناوە..

پیاوەکە لەو دەمەی کە فرمێسکی چاوەکانی" ڕێیان نەدەدا بە باشی بدوێ گوتی:

– جەنابی شێخ برینێکی سارێژ نەبووت کولاندمەوە، واتکرد زیاتر لۆمەی خۆم بکەم، چوون هەر لەیەکەم دیدارمان بە ناشایستەیی لەگەڵت دووام، ببورە قوربان من پێگە و پایەی تۆم نەزانی، هەڵسوکەوتێکی ئاوام نواند ئازاری دایت. تەنانەت لە بێئاگایی خۆم ستەمێکی گەورەم لە ئامۆژگاری و بانگخوازان کرد، بەلاّم خودا دەزانێ ساردی و وشکیم لە دڵەوە نەبووە، بەڵکوو ورێنەکردنی نەخۆشە کاتێ تایەکەی بەرز دەبێتەوە، یان بێ ئاگایی مەیخۆرە کاتێ زێدەڕۆیی لە خواردنەوە دەکات.

بۆیە تکایە بمبوورە .. بمبوورە بۆ ئەوەی منیش لە خۆم ببوورم!، ئەگینا پەشیمانی بەرەو کاریترم پەلکێش دەکات.

پێمگوت: هیچت لەسەر نیە براکەم، ئەوە من بووم تەنهاییەکەتم تێکدا، بانگکەرێك بۆ لای تۆ بانگی کردم، هاتم تا ئامۆژگاریت بکەم، وەلێ بەڕاستی تۆ بوویتە ئامۆژگاریکارم!.

دواتر پێیگوتم: جەنابی شـێخ بە خودا من قەدری تۆم نەدەزانی، بۆیە ئەوەم بەرامبەرت کرد، باشە چۆن ئەوەندە ئارامت لەسەر ڕەفتارەکانم گرت، لە کاتێکدا تۆ لە نێو قوتابیەکانت بە باشـە و زاناو پێگەبەرزی پەسـنت دەکەن، تەنانەت بوویتە جێگای قسـەوباسـی خەڵکی! سـوێند بە خودا ئەو ڕەوشت بەرزیەیی و نەرم و نیانیەی لە جنابتانم بینی بالاتربوو لە زانستە زۆر و فراوانەکەت.

بزەم بە ڕوودا کرد و پێمگوت: دیارە من و کارەکەمت زۆر لا گەورە بووە، بەلام لە ڕاستیدا بچووك و سادەیە. واز لەو هەموو ئەمانە بێنە براکەم، داوای ڕێنموونی و دامەزرراوی بۆ خۆم و تۆش دەکەم، مۆڵەتم لێ خواسـت و ڕۆیشـتم، ئەویش گەڕایەوە سەر کارەکەی.

دوای قسـەکردم لەگەڵ پیاوەکە، بە یادگەی خۆمدا چـوومەوە و بیری پێشـووم دەکردەوە، بیری ئـەو کـاتـانـەم دەکردەوە کـە وەکوو ئـەو بووم، بگرە لـەو خراپتریش بووم. ئایا کاتێ گرنگی بەو پیاوە دەدەم لەبەر ئەوەیە کە خۆشـم پێشـتر لەو حاڵەتدا بووم؟ ئایا یارمەتیدانی ئەو لەبەر ئەوەیە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان منیش وەکوو ئەو بووم؟ کاتێ من لە حاڵ ئەودابووم خودا کەسـێکی بۆ ڕامکردم و بەرەو سـەرفرازی دەسـتی گرتم، باشـە بۆچـی من ڕەزیلی بنوێنم بەرامبەر کەسـێك کە قاچـی شـکاوە و پێکانی هەرزەلییە، بۆچـی یارمەتی نەدەم و ئەو تەمەی بەری چاوی گرتووە لای نەبەم .

دوای وانەی بەیانی، هەمان ڕۆژی ئاهەنگەکە تەنها بووم، مزگەوتیش جمەی دەهاتن بە شێوەیەك بوو لەوەتەی هاتم بەم شێوەیەم نەبینی بوو.

ئاشـكرایە خەڵكی، تەنانەت ڕەشـۆكی خەڵكیش تامەزرۆیی بینینی ئاهەنگەكەن، دەڕواننە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئاهەنگەكە، بە تایبەت كە میوانەكان لە گەورە و سەردارانی نەوەی پێغەمبەرن( د.خ) لێبێت.

دوای گوتنەوەی وانەكان بۆ خوێندنی ویردەكان دانیشـــتم و (مالیك)یش لە كنم بوو، چـــەند خولەكێكی كەمی پێچـــوو هاوڕێكەم( عومەر) ی تەوبەكار هات و لە تەك ( مالیك) ڕوونیشـــت، بە چـــپە لەگەڵ یەك دووان" وەلێ لەبەر مژوڵیم بە ویردەكان لە قســـەكانیان نەگەیشـــتم، وەلێ دواتر مالیك پێیڕاگەیاندم كە عومەر دەیەوێ هاوسەفەریم بكات، بەو مەرجەی نەبێتە هۆی زەحمەتی بۆت.

بزەیەكم كرد و گوتم: ئێستا لەوە گەڕێن، دواتر لەبارەیەوە دەدوێین ئینشائەڵڵا.

لە نیوەڕۆدا هەموو شـــتێك باش بوو، پیاوان مژوڵی ئامادەكردنی شـــوێنی ئاهەنگەكە بوون لە نزیك ماڵی "شێخ صەفا"، هەروابێتەوە چوارپایان دانابوو و ڕایەخیشـــان ڕاخســـتبوو، ئەمە دوای ئەوەبوو كە دەنگ بەرزكەرەوەكانیشـــیان ئامادەكردبوو.

ئەو چـــەند كاژێرەی بەر لە ئاهەنگەكە زۆر خۆش بوون، باری دڵخۆشـــی و كامەرانیی ڕووخســـاری هەموانی تەنیبوو، كۆبوونەوەیەكی پڕ نوور و فەڕ بوو، پەیوەندی ڕووحیی نێوان موســـڵمانانی پتەوتر دەكرد و شـــوێنەواری گەورەیی ئاینی لە دڵەكان جێدەهێشت.

دوای نوێژی عەسر من و جەنابی شێخ و سێ كەس لە كەسە دیارەكانی لادێ بۆ پێشوازی لە میوانە بەڕێزەكانی مەغریب چـووینە فرۆكەخانە، لەگەڵ سـەرەتای

عیشا گەیشتنە فرۆکەخانە، ڕووی درەوشاوەیان نیشانەی پەرستش و بەندایەتی بوو.

سێ پیاو بوون، کە ڕۆشنایی و ڕوناکیی و شکۆ و ڕێزیان لێ بەرز دەبوویەوە، دەتگوت خۆر لە ڕووخساریاندا سەرچاوەی گرتووە، سیمایان جوانی شەرمەزار دەکرد، لە خەڵکیی جیاواز بوون، وەك بڵێی لە توخمێکی جیاواز و سەربەخۆن و لە بەهەشت پێگەیشتبن، بۆ نا کاتێ نەوەی پێغەمبەرن(د.خ) و توخمی دووریش لای کەس نامۆ نیە.

هەر چۆنێك بێت چاو لەوانی جوانتر نەبینیوە، سەرسام نەبووم کاتێ منداڵان بە هوتاف و ئافرەتان بە هەلهەلە و پیاوانیش ڕۆندکی شادیان لە چاواندا دەباری و لە گۆنایداندا دەتکا، ئەو گەورە مەردانەی خوداش لەو خاکێتیەی باپیرەیان (د.خ) بۆ ماوەتەوە، سلاو لە خەڵکەکە دەکەن و دەست بەسەر منداڵان دادێنن..

بزە لەسەر لێوانیان ون نابێت و ئارامیی و شکۆ لە خاسێتەکانیانە..

هەرزوو تەنێ بە بینینی ئەوان جەنابی شێخی مامۆستام بیرکەوتەوە.

چـــوونە پێش بۆ بەخێرهێنانیان، لە هەموویان بە تەمەنتر جەنابی" شـــێخ موحەممەد حەبەشی"بوو، دووەمیان بە" شێخ مەڕوان" ناودەبردرا، سێیەمیان ناوی " ســـەید ســـولێمانی مەغریبی" بوو، هەموویان زانای خواناســـی خەڵکی مەغریب بوون، هەر یەك لەوان مێژوو و ژیاننامەیان نووســـراوە، لەبارەی ژیانیان ژمارەیەك زانای عەرەب پەرتووکیان لەبارەی ژیانی ئەوان نووسیووە، بە تایبەت زانایانی شـــەرعزان، چـــوون مەیدانی ئەو مەردانەی خودا بریتی بوو لە مەیدانی شەریعەت..

لە ڕێگادا شـێخ مەڕوان گوتی: جەنابی شـێخ ئەحمەد پێشـتر تۆم لە لادێکە نەبینیوە، ئایا تۆ پێشتر گەشتتکردووە و گەڕاویتەوە ؟

"شێخ صەفا" گوتی: لە ڕاستیدا قوربان ئەوە " شێخ ئەحمەد"ە، لە زانا پیتۆڵەکانی" ئەقسەر"ە، قوتابی شێخێکە کە بە " شێخ مەهدی" بەناودەنگە" یەکێکە لە گەورە زاناکانی ناوچەی" ئەقسەر" ئەو زاوای جەنابی شێخ مەهدیشە، لە سـەردانێکمان بۆ گۆڕسـتان پێیگەیشـتین، لەکاتێکدا ئەو بۆ گەشت هاتبوو، داوامان لێکرد لامان بمێنێتەوە و ئەو پەرتووکەی کە نەمانتوانی لە خزمەت مامۆسـتاکەی تەواوی بکەین لای ئەو تەواوی بکەین، جەنابیشـیان بە دەم داواکاریەکەمان هات و سپاس بۆ خودای جیهانیان.

شێخ موحەممەد حەبەشی گوتی: ماشائەڵلا خودا زانست و نوورت زیاد بکات.

لەلایەن شێخ و قوتابیەکانی بانگێشت کرابوون کۆبوونەوە، شەوێکی لەبیر نەکراو بوو.

جەنابی شێخ صەفا بە پێشەکیەك دەستی پێکرد و بەخێراتنی میوانەکانی کرد، بە تایبەت میوانەکانی وڵاتی مەغریب، دوای ئەو نۆبەتی جەنابی شێخی حەبەشی هات و وتەی خۆی پێشـکەش کرد، کە بریتی بوو لە پێداگیریی و دەسـتگرتن بە ئایین، ئەو وتاری جەنابیان بووە جێی سەرسوڕمانی هەموو ئامادەبووان.

دوای ئەو شـێخ مەڕوان وتاری خوێندەوە، وتارەکەی ئامانجدار و ڕەوان و پڕ سوود بوو، شوێنەواری لە سەر دەروونی خەڵکی جێهێشت، تیایدا باسی ئەوەی کرد کە بوونی شـێخ بۆ مورید لە گرنگترین پێویسـتیەکانە، شـێخ یارمەتیدەری

موریده و بارگرانی ڕێگەی لە سەر هەڵدەگرێت، دواتر بابەتەکەی بە باسی ئیسرا و میعراج بەستەوە و بە دەربڕینە جوان و دانسقەکانی هەمووانی شۆک کرد.

دواتر نۆبەتی بەندەی هەژار هات و تیایدا باسی ئەوەم کرد کە ڕووداوی ئیسرا و میعراج بەخشـشـێکی خودایە و لە هەرە گەورەترین بەخشـشـەکانە، کە تیایدا نوێژی بە دیاری بەخشیە پێغەمبەر (د.خ) و ئومەتەکەی، ئەو نوێژەی وێستگەی پەیوەندی ئێمەیە بە پەروەردگار و ڕۆژانە پێنج ڕوحەکانمان دەچـێتە خزمەتی پیرۆزی، جا ئەوەی دەیەوێ نزیکبێتەوە با کڕنۆش ببات.

شـەوڕەوی پێغەمبەر(د.خ) دابەزینی ڕەحمەتی خودا بوو بەسـەر پێغەمبەر، لەوەدا گەورەترین نموونەی خۆراگیری و ئارامگرتن هەبوو بۆ شـوێنکەوتوانی، ئەگەر زەوی نکۆڵی پەیامەکەی بکات و پشت لەو بکەن بێگومان ئاسمان بەسە لەخۆی بگرێت.

لە کۆتاییدا ئاهەنگەکە بە ستایشی یەکێگ لە کوڕەکانی "شێخ صەفا" کۆتایی پێهات و بە دەنگە بە سۆز و کاریگەر و ناسکەکەی دڵی ئامادەبوونی جۆشـاند، ئەو کوڕە دەنگێکی فریشـتە ئاسـای پێبەخشـرابوو، لە دڵەکان بڵێسـەی سۆز و تامەزرۆیی دادەیسـاند، چـوون دەنگەکەی لە دڵێکی پاك و هەسـتێکی باڵاوە سەرچاوەی دەگرت.

وای بڵاوەکردنی ئامادەبووان لەگەڵ میوانە بەڕێزەکانی مەغریب چووینە شوێنی پشـوودانیان، من و مالیك و هاوڕێی تەوبەکارەکەم دانیشـتین، ئەو هاوڕێیەم بە درێژایی ڕۆژەکە جێینەهێشتم!

هاوڕێکەم خەمبار و دڵتەنگ بوو، ئەمەت بە ڕوونی لە نێوچـاوانی بەدی دەکرد، بە خۆمم دەگوت: لەوانە ئەوە ئەو دڵتەنگیە بێت کە تەوابەکار دوای تەوبەکەی

هەستی پێ دەکات، هەڵەکانی ڕابردووی بیر دەکەوێتەوە و پەشیمانە لێی، تۆبەکەی هاوکات بوو لەگەڵ ئاهەنگە پیرۆز و وتارە بە پێزەکان، وای کرد دڵی بگوشرێ و بجۆشێ و لە چاوانیدا ڕۆندکی پەشیمانی ببارێنێ، ئەمە ئەگەر ئەمە نیشانەی چتێك بێت بێگومان ئەو چتە توبەیەکی ڕاستگۆیانە و خوێکی باش و دڵێکی سەلامەتە، دەبا هاورێکەمان بەوە دڵخۆشبێت، چون ئەمە نیشانەی قەبووڵبوونە.

ئەو دەمە لای ئەو ویستم چیرۆك و بەسەرهاتی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، بە هیوای ئەوەی دڵی خۆی پێبداتەوە و بێ ئومێدی فرێبدات و دەست بە پەتکی ئومێد و هیواوە بگرێت، بەسەرهاتی خۆم لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕانەوە و ئەوانە بێ دەنگ گوێیان بۆ شل کردبوو، نیشانەی سەرسوڕان بەری ڕووخساری داپۆشیبوون، لەوانەیە گەر لەبەر شوێن و خۆشەویستیم لە دڵیان نەبووایە ئەستەم باوەڕیان دەکرد.

هەروەها جەنابی "سەید عومەر"یش گوێی بۆ بەسەرهاتەکەم گرتبوو، کاتێ تەواوبووم دەستێکی بە سۆزی بەسەر شانمدا هێنا.

دەنگی "شێخ صەفا" قسەکانی بڕین، ئەو دەمەی لە ناوەوەی ماڵەکە هاتە دەر و دڵنیابوو لەوەی کە میوانان لە شوێنی دیاریکراودا لە پشوودان، دواتر هات و گوتی: بەڕێزان لەگەڵ خۆتان بەشداریم پێبکەن با سوودێکتان لێ ببینین، بەدڵنیاییەوە قسەکانتان گەرم و خۆشە.. هەموومان پێکەنین، گوتم: قوربان ئێمە بە دوای سوود وەرگرتنین لە دانیشتنەکانت.

تێبینیم کرد هاوڕێیە تەوبەکارەکەم شوێنەواری خەمباری بەڕووخسریەوە نەماوە و بزە دەکات و لەو نێوەندەدا بە ئا سوودەیی دەئاخفیتن، زۆر دڵخۆش بوو کاتێ بینیم لەو خەمبارییەی دەرهاتووە و بەرەو هیوا و ئومێد هەنگاو دەنێ.

دوای ئەوەی لەگەڵ "شێخ صەفا" لەبارەی ئاهەنگەکە شەنوکەوی بابەتەکەمان کرد هاوڕێکەم مۆڵەتی ڕۆیشتنی وەرگرت، ئەو دەمە نزیکی شێخ صەفا و مالێك بووم، لێی نزیکبوومەوە و بە گوێمدا چرپاند: ڕاستگۆیی، یەکەم پایە ڕاستگۆییە..پێیەوە پابەندبە، ئەو دڵنیایی گەیشتنتە. لە مەبەستەکەم گەیشت و بە سەری ئاماژەی بەڵێی کرد و بە بزە و ڕەزامەندیەوە ئێمەی جێهێشت.

تۆزێك پێش بەرەبەیان وەکوو هەمووجار من و شێخ صەفا لە خەو هەستاین، کاتێك تێبینی کرد ڕووناکیی ژوورەکەم دایساوە هاتە لام و سپپاس و پێزانینی خۆی دەربڕی و پەسنی ڕۆڵی منی کرد لە ئاهەنگەکە و نزای چاکەی بۆ کردم، ئەو پیاوێکی نەرموونیان بوو و چاکەی خەڵکی دەویست.

- پاشان گوتی: جەنابی شێخ تۆ تەنها سێ ڕۆژت لای ئێمە ماوە، من داواکاریەکم لێت هەیە، حەزەکەم جێبەجێی بکەی، ئاراستە و شوێنی داهاتووت کوێیە؟

گوتم: نازانم، لەوانەیە ڕوو لە سوودان بکەم.

گوتی: تکات لێ دەکەم لە کاتی گەڕانەوەت سەرێك لە ئێمە بدە ئینشائەڵلا، تکایە بەڵێنی ئەوەم پێبدە..

هیچ بەرچاو ڕوونیەکم نەبوو تاوەکوو پێی بڵێم: پەیمانت پێ دەدەم گەر بۆم لوا وادەکەم ئینشائەڵلا.

دواتر هەندێ پرسیاری زانستی ڕەفتارکردن و هەندێ بابەتی تری لێکردم، کە بە دەستیەوە گیری خواردبوو، وەڵامدایەوە و سپاسی کردم و ڕۆیشت.

وەکوو هەمیش دوای نوێژی بەیانی وانەکانم دەگوتەوە، لە ناو وانەیەکیان چیرۆکێکم گێرایەوە کە لە جەنابی "شێخ مەهدی" گوێبیستی بووم، پوختەی ئەوەبوو: ( پیاوێکی نابینا و لەگەڵ خودا خاوەن حاڵ لە شوێنێکی ئاسیا دادەنیشێت کە پێی دەگوترێ ئەندەنوسیا..

ئەو پیاوە وەکوو نواندنی ئەدەب بەرامبەر خودا هەمووجار وەکوو دانیشتنی تەحیات دادەنیشێت، لەگەڵ هەژاران دادەنیشێت و لەگەڵیان نان دەخوات و ئامۆگاری چاکیان دەکات، ماڵەکەی شوێن و پەناگەی هەژاران و لێقەوماوانە، تەنانەت کچەکەشی لە کەسێکی هەژار مارە بڕیوە، کەسێکی هەژاری وەکوو ئەوانەی سەردانی دەکەن و لەگەڵیان دادەنیشێت، ئەگەرچی پێشتر یەکێك لە کەسە دیارەکانی ئەوێ هاتبوویە خوازبێنی کچەکەی، دووایین ساتەکانی بە مردنێکی جوان کۆتاییهات، خەریك بوو هەندێك پارەی لە باخەڵیدا دەردەهێنا و دەیبەخشیە هەژارێك لەو ساتەدا ڕوحە پاکەکەی لە جەستەی جوایەز بوویەوە و بەرەو ماڵی کامەرانی و هەمیشەیی چوو..

تێبینی "سەیدی حەبەشی"م کرد، لە ئانوساتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە ڕەنگی ڕووخساری گۆڕا! نەمزانی نهێنی ئەو گۆڕانەی ڕووخساری چی بوو! ترسام بێ مەبەست و ئاگایی شتێکم گوتبێت بووبێتە مایەی ناڕازیبوونی ئەو، لەسەر ئەمە سەرزەنشتی خۆم دەکرد.

بۆ خوێندنی ویردەکان لە تەك یەکێك لە کۆڵەگەکانی مزگەوت دانیشـــتم، دوای تەواوبوونی ویردەکانم جەنابی "سـەید حەبەشـی" هاتە لام و سـڵاوی لێکردم، منیش بە دڵخۆشیەوە وەڵاممدایەوە، گوتی:

-( ماشـــائەڵلاّ کورِم! داوام لە خودایە بەخشـــشـــەکانی دونیا و دوارِۆژت پێ ببەخشێت).

بارە کەڵلاّ قوربان، خودا بە هۆی تۆوە ســـوودی پێگە یا ندووین، من تەنێ فێرخوازێکی کەمترخەمم.

- رِۆڵە گوێم لێت بوو باســـی شـــێخێکی خۆتت دەکرد بە ناوی" شـــێخ مەهدی" ئایا دەکرێ باسـێکی ئەوم بۆ بکەی؟ لە کوێ هاتووە و خزمی هەن یان نا؟ بۆم باس بکە رِۆڵە رِەحمەتی خودات لێبێت.

ئەوەی راســـتی بێت قوربان، خێزانەکەم کە دەکاتە کچـــی ئەو دەربارەی باوکی دەیگوت: باوکم لە ( حەزرەمەوت)ی یەمەن هاتووە و هیچ خزمێکیان لەو وڵاتە نیە..

- ئـا بـەڵێ ..بـەڵێ... رِەحمـەتی خودای لێبیـت، خودا بـە ئێوە ســـوودمەندمان بکات، ئەوەی گوت مینا ئەوەی بە دوای شـــتێکدا بگەرِێت، نەمدەزانی ئەو شتە چیە؟

ئەوەی دیاربوو شـــتێك لە خەیاڵی جەنابی ســـەید دا دەخولایەوە، ئەگەرنا چ مەبەســتێکی لەو پرسـیارە هەبوو؟ هەرچیەك هەبێت سـپاس بۆ خودا ئەو هیچ تۆرِە نەبوو هەروەکوو وای بۆ چووبووم.

دوای ئەو ماوە کورتەی لامان مانەوە میوانەکانمان بەڕێکردن. بۆ سپێدەی ڕۆژی دواتر شمەکەکانم کۆکردەوە بە مەبەستی خۆ ئامادەکردن و ڕۆیشتن بۆ ئەو مەبەستەی کە بۆی لە ماڵ دەرچووبووم، کاك عومەری تەوبەکار هاتە لام و "مالیك"یشی لەگەڵ بوو، داوای لێکردم کە هاوڕێیەتیم بکات لەو گەشتەم، ڕەنگە ئەمە ببێتە هۆی ئەوەی پەن و زانست وەربگرێت و قەرەبووی بە فیڕۆچوونی تەمەنی بکاتەوە، لەوانەیە ئامۆژەیەك باشتر بێت لە سەت ڕستە... بەو شێوە و خاکییەوە دووا.

زۆر دڵخۆش بووم بە بیستنی ئەمە و ڕەزامەندیم دەربڕی، لە چاوانی" مالیك"یش ئەوەم دەخوێندەوە ئەویش حەزدەکات ببێتە سێیەممان، بەڵام شەرم وای کردبوو نەتوانێ ئەو داوایە پێشکەش بکات، بە تایبەت دوای ئەوەی زانی کە "کاك عومەر" بەو گەشتەدا هاوڕێیەتیمان دەکات.

بۆیە من دەسپێشخەریم کرد و گوتم: تۆ "مالیك" گیان.. چی دەڵێی؟ لەگەڵمان دێیت یان ئەو گەشتە لەگەڵ تۆدا ناگونجێ؟

گوتی: لە ڕاستیدا قوربان زۆر حەزەکەم بێم لەگەڵتان، وەلێ دەترسم ئەمە پێچەوانەی ویستی "شێخ صەفا" بێت، پێمگوت: مەترسە، گەر ویستی هاتنت هەیە دەتوانم لە جەنابی شێخ داوا بکەم، ئینشائەڵڵا ڕەزامەندی دەنوێنێ.

مالیکی لاو گوتی: بۆ ئەوە زۆر سپاست دەکەم قوربان.

- کەواتە خۆت ئامادە بکە، لەوانەیە ئینشائەڵڵا لە بەیانی زوو بۆ گەشتە بانگت بکەم..

دوای بەرەبەیان و خوداحافیزیم لە جەنابی شێخ کرد و پێداگیری کرد لەوەی گەر هیچ ئاستەنگێك نەبوو جارێکی تر سەردانیان بکەم، پەیمانم دانێ کە دەگەڕێمەوە لایان و سەردانیان دەکەم جارێکیتر ئینشائەڵلآ، داوای "مالیك"یشم کرد لەگەڵمان گەشت بکات، ئەویش ڕەزامەندی نواند، بانگی ئەو گەنجەم کرد بۆ ئەوەی دەست بە گەشتەکە بکەین، پێش ئەوەی بڕۆم خوداحافیزیم لە هەموو ئەوانە کرد کە لەو لادێیە پەیوەندیم لەگەڵیان هەبوو. ئەو هەژارەی کە بۆ ژەمی نیوەڕۆ داوەتی کردبووین. ئەو پیرەژنەشم لەبیر نەکرد کە هەرکات منی بینیبا نزای بۆ دەکردم، ئەو فرۆشیارە گەرۆکەش کە لە کۆتایی لادێ لە خانوێکی بچوك دەژیا، تەنانەت ئەو منداڵانەش کە جاروبار لە گەڵیان دادەنیشتم... کەسم بیرنەچوو.

پشتمان لە لادێ کرد و خەریکبوو جێماندەهێشت، گوێم لە دەنگێك بوو لە دوواوە بانگی دەکردم و بەرەو لامان ڕایدەکرد..

بە دەنگی ئەوەوە وەستاین، کە بینیمان گەنجێکی خورت و بەهێز و جوان گەیشتە لامان، وام گومان برد یەکێ لە فێرخوازانی جەنابی "شێخ صەفا" بێت یان کەسێك بێت لەوانەی کە ڕۆژانە بۆ گوێگرتنی وانەکان ئامادە دەبوون.

کاتێ گەیشتە لام خۆم نزم کردەو و دەستی ڕاوسیم و گوتی: هاتم تا خوداحافیزیت لێبکەم قوربان، خەمباری ئیشی خۆی لێ دەبینیم گەر نەهاتبام.

- ڕۆڵە تۆ کێیت؟

قوربان نامناسیت.. یەکەمجار لە مەیخانە نەگریسەکە تۆم بینی، سەری نزم کرد و پاشـــان درێژەی دایێ: بە تۆ و کەســـایەتی تۆوە پەیوەســـت بوومە قوربـان، دوای ئـەوەی کـە زانیم لـە مزگـەوت وانـە دەڵێیتـەوە بـەردەوام ئامادەیی وانەکانتم، هاتوو خودا بکەمە گەواهیدەر تۆم خۆشـدەوێ قوربان بەڵام... بەڵام قوربان هاودەمی مەیخواردنەوەم! بەڵێ سـەرخۆشم قوربان، ئێوەش گوناهباران و ڕووچـوانی وەکوو ئێمەتان خۆشـناوێت، وەڵێ باوەڕم پێبکە..باوەڕم پێبکە قوربان بێ ڕەوشت و شەرواڵپیس نیم، بە پێچەوانەوە خواپەرست و چاکەکارانم زۆر خۆشدەوێت، بەڵام دەروونی خراپم زاڵ بووە بەســـەرمدا و خراپەم پێ دەکات، .. هیوام وایە ڕزگارم بێت بەڵام ناتوانم بەسەردا زاڵ بم، داوام لە خودایە ڕزگارم بکات قوربان .

– ڕۆڵە کێ وتوویەتی ئێمە ڕقمان لە گوناهبارانە؟ ئەوە کێیە بوێری ئەوە دەکات وەك بڵێی بەڵگەنامەی لێخۆشبوونی خەڵکیان لە دەستە، بەو دەبەخشن و لەو قەدەخە دەکەن. ئایا هەموو مرۆڤێك هەڵە ناکات؟ ئایا هەموو ناکەونە نێو بازنەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموو: ( بڵێ ئەی ئەو بەندانەی زێدەڕۆییان کردووە و ســـتەمیان لە خۆیان کردووە بە گوناهکرد، ئیتر لە ڕەحمەتی خودا بێ هیوا مەبە، هەریەکەمان بۆی هەیە فرمان بە تەقوا و ئامۆژگاری بە تەوبە و گەڕانەوە بکات، ئەگەرچی کەسەکە پەڵەدار و تاوانبتریش بێت.

ڕۆڵە بگەڕێوە لای خودا، خودا بە گەڕانەوەت خۆشـــحاڵ دەبێت و لێت ڕازی دەبێت. پاشان وریابە خۆت بەکەم مەزانە تۆ لای خودا خاوەن ڕێز و پایەیت.

من دوای گەڕانەوەم لەو گەشتە دەتبینمەوە، هیوادارم ئەوکات لەسەر باشترین حاڵ بتبینم ڕۆڵە، خودا ئاگادارتبێت.

ئینشائەڵلاَ دوای گەڕانەوەمان لەگەڵ مالیك سەردانت دەکەین، .

- مالیك ماڵەکەی پێدەزانیت؟
- بەڵێ قوربان.
- ڕۆڵە پەیمانم بدێ تەوبە بکەیت و هەوڵی خۆت بدەیت..
- گەنجەکە پەیمانێکی ڕاستگۆیانە و نیازمەندانەی پێدام، نزام بۆ کرد یارمەتی بدات و ڕێگای ئامانج و مەبەستی ڕۆشن بکات.

سواری شەمەندەفەر بووین بەرەو ئەوپەڕی باشووری پارێزگای "ئەسوان" کەوتینە ڕێ، دوو هاوڕێکەم ئارام و ڕەزا مە ند بوون، نزا مان کرد خودا لەو گەشتەماندا سوودمان پێبگەیەنێت و سەلامەتمان بکات.

گەیشتنیە سوودان، ئەو زەویەی کە سروشتەکەی یارمەتیدەرە بۆ سەلامەتی و پاڵەفتەبوون، سوێند بە خودا هەر ئەوەشە ڕێبوارانی خەڵوەت و پاڵەفتەیی داوای دەکەن و هیوای بۆ دەخوازن، زەویەکە پارچەیەکە لە سەوزایی و گیا، پڕ فەڕ و بەرەکەتە، ڕەنگی گژ وگیا و سروشتەکەی هاندەری ملکەچی و پەرستشکردن بوو.

لە شارۆچکەیەك دابەزین کە لە هەموو لایەك بە دارخورما دەوردرابوو. لە شارۆچکەکانتر دوور بوو، مینا بیەوێ خاسێتی تایبەت بە خۆی وەربگرێت یان وەکوو هەژارێك وابوو دوور لە خەڵکی مژوڵی وریدەکانی بوو و وەکوو خەڵکی بە ژاوەژاوی دونیا سەرقاڵ نەبوو.

شەو گەیشتین و تاریکی پەچەی ڕەشکی خۆی پۆشیبوو، لەودەمەی خەڵکی لە قولآیی خەویان بوون ئەو دەردەدڵی لەگەڵ پەروەرێنی دەکرد! ئەمەیە شەو .. ئەگەر خەلوەتکێشانیش چاوەکانیان لێکبنێن ئاشقان ناخەون، بەڵکوو لە شەودا لەوپەری هیمەتدانە بۆ ئەوان شەو هەموو شتێکە، چوون پشت لە خەو دەکەن و لەسەر پێکانیان دەوەستن و وەستانیان بەرامبەر خودا درێژە پێدەدەن، ئەوەی دەیەوێ نزیکبێتەوە با پەیوەستی شوێنی پەرستش بێت.

گەشتکردن" ڕەوشتەکان دەردەخات، ئەزموون دەبەخشێت، ئەقل کارا دەکات، ژیان گەورەترین هۆڵە، چیرۆکی خەڵکیش باشترین وانەیە، لە گەشتکردنیشدا بالآترین ئاستی زانیاری وەدەست دێت، هەر بۆیە مالیك پێداگیربوو لەسەر ئەوەی لەگەڵ شێخ ئەحمەد گەشت بکات، پەیمانی بە خۆیدا چاو و گوێی بکاتەوە و ئاگاداری هەموو ئەو حاڵ و دۆخانەبێت کە شێخ لەو گەشتەدا پێیدا تێپەڕ دەبێت.

بەڵێ مالیك هەموو ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو گەشتە پیرۆزەی تۆمار کردووە، بە شێوازی سادە و جوان دایڕشتووە، بۆ ئەوەی دواتر بۆ خێزانەکەی باسی بکات، با گوێ بۆ مالیك بگرین بزانین چی ڕوویداوە:

مالیك دەڵێ:

جەنابی شێخم زۆر خۆشدەویست، تەنێ دانیشتن لەگەڵی هیمەتی بەرز و بالآ دەکردم.. ئەو شەوە لە ژێر دارێکی گەورە و کۆندا خەوتین، تاك و تەنها بوو، ئەو دەمەی نووستبووین ئاژەڵێکمان لێ پەیدابوو، لەبەر ئەنگوستەچاوی شەوەکە نەمدەزانی چ گیاندارێکە، وەلێ هاوشێوەی سەگ بوو، ئەوەندەهەبوو

لە سـەگ بە قاپێلتر بوو، بۆ لای ئێمو دەهات، دوای ئەوەی بە دەنگی ڕۆیینی واگاهاتین جەنابی شێخ بە دەنگی بەرز هاواری کرد ..ئەڵلآ.....ئەڵلآ! زۆر سەیر بوو ئاژەڵەکە سـەری خۆی دانەواند و تێپەڕی وەك ئەوەی ئێمەی نەبینیبێت! ئەمە یەکێك بوو لە کەڕاماتەکانی شێخ کە حەزی نەدەکرد ئاشکرای بکات، بەڵام لە دۆخی لەم شێوەیە پێویست بوو دەریبخات.

بەم شێوەیە پیاوچاکان کەڕاماتەکانیان دەشارنەوە و پێداگیرن لەسەر ئەوەی دەرینە خەن و نهێنیاکانیان دەشـارنەوە، هەروەکوو چـۆن خراپەکاران گوناهەکانیان دەشـارنەوە، بۆیە کەڕامەت نیشـاننادرێت گەر ناچـاری نەبێت ئەوەش بە کردار ڕوویدا.

دوای بەیانی جەنابی شێخ کۆیکردینەوە و پێداگیر بوو لەوەی پێویستە لەبارەی ئەوەی ڕوویداوە هیچ کات باسی نەکەین، بەوەوە لە خۆبایی نەبین، بەڵکوو ئەمە بە فرمانی خودایە، بەردەوامیی و مانەوە لەسـەر ئیمان لە هەزار کەڕامات باشترە، بەڵێنماندا هەتا زیندووبێت ئەو نهێنیانە ئاشکرا نەکەین. ڕوومانکردە ناو گوندەکە، یەکەم شـوێن چـووینە ناو بازارەکە و خەڵکەکە لە هەموو لایەك چـاودێری دەکردین. ئاشـکرایە کە لادێکان ژمارەی دانیشـتوانیان کەمە و ڕووبەرەکەشی فراوان نیە، خەڵکەکە یەکتری بەباشی دەناسن، بۆیە وەکوو نامۆ و جیاواز سەیریان دەکردین.

هەندێ خۆراکمان کڕی

لە ڕاسـتیدا برسـێتی برسـتی لێبڕیبووین، بەشـێکی خۆراکەکەی پێشـوومان تێکچووبوو و بەشەکەی تریش تەواو بوو بوو.

دوای نانخواردن کەمێ بە نێو گوندەکەدا پیسەمان کرد، بە پیاوێك گەیشتین لەبەر دەرگایەك دانیشتبوو، وا دیاربوو ماڵی خۆیەتی، کاتێ بینیمان جەنابی شێخ فەرمووی: ماشائەڵڵا، چوو لەگەڵی ئاخەفت، کە گەڕایەوە گوێمان لە پیاوەکە بوو دەیگوت: ڕووناکیەك لە ڕووخساری بێگانەیەك دەبینم..

دوور لە هەموو شتێك ئەوەی سەرەنجی منی ڕاکێشابوو لە لادێکە خەڵکە سادە و هەژارەکی بوو، ئەمان وەکوو خێ وابوون بۆ زەوی، بە هۆی ئەوانەوەیە ڕەحمەتی خودا دادەبەزێت، باوەڕم بەو وتەیەی زانایان هەیە کاتێ دەفەرموون: خودا دادپەروەرە و ستەم لە بەندەکانی ناکات، لە دونیادا ڕۆزیەکانی بەسەر بەندەکانیدا دابەشکردووە، هەیانە ڕۆزیەکەی بریتییە لە سەلامەتی جەستە و زۆری منداڵ، هەیانە ڕۆزیەکەی ماڵی زۆر و بەردەوامی ئیش و کار و سامانە.. ئیتر هەریەکە و بە جۆرێکە... خودا ستەم لەکەس ناکات.

بەش و ئەندازەکان لە ئەزلدا نووسراوە، ئەوەی لەماڵ هەژارە لە لایەکی ترەوە دەوڵەمەندە، وەلێ خۆی نایبینێت، بەڵکوو لەپێشتر و باشترە نەیبینێ، دەوڵەمەند هەیە گەر لێیبگیردرێتەوە سەرەڕۆ و بەدبەخت دەبێت، ئەگەرچی بەزەییمان بەو منداڵە هەژارانە بێتەوە کە بە دەست هەژاری و نەبوونیدا دەناڵێنن، وەلێ بیر و ئیدقاتمان ئەوەیە کە خودا دادپەروەر و شارەزا و زانایە، بەهۆی حیکمەتێکەوە دەبەخشێ و بە هۆی حیکمەتێکیشەوە دەستێنێت و قەدەغەی دەکات و، هیچ کەسێکیش هاوبەشی بڕیاری ئەو نیە.

بە ڕێگای لادێکە پیاسەمان دەکرد، خانووەکانی زۆر بچووك بوون مینا ژیانی خەڵکە سادە و ساکارەکەی، ڕێگاکانی تولەڕێ بوون هەروەکوو چۆن خەڵکەکەی

پێداگیربوون لەسەر ئەوەی تێکەڵ و خۆشڕەفتاربوون لەگەڵ خەڵکی بێگانە، وەلێ وادیار بوو لە شتێك دەترسان..! کەس بوێری ئەوەی نەدەکرد ڕامان بگرێت و پرسیار بکات کێین چمان دەوێت! لەگەڵ ئەوەش سەرسوڕمان و چاوتێبڕین و پرسیار لە ڕووخسارياندا بەرز دەبوويەوە.

ئێمە لە ڕێگابووین، گفتوگۆیەك لە نێوانمان درووست بوو کە جەنابی شێخ دەسپێشخەری بوو و گوتی: ئایا حەزەکەن لە ڕۆژی دوایی لە نێوان خەڵکێك حەشر بکرێن کە ناتانناسن وەکوو ئەو خەڵکی ئێرە کە ناتانناسن یان دەتانەوێ لە نێوان خەڵکێك بن بیانناسن و بتانناسن؟!

مەبەستی شێخ تێگەیشتم و گوتم: نەخێر، بەڵکوو حەزەکەم لەناو خەڵکێك حەشر بکرێم کە نەیانناسم و نەمناسن، بۆ ئەوەی لە ناو خەڵکیدا ئابڕووم نەچێت.

- لەوانەیە ئەمە هۆکارێك بێت لەو هۆکارانەی کە ڕێبوارانی تەسەوف پاڵناوە بۆ گۆشەگیری و هەڵبژاردنی شوێنێکی دوورەدەست و سادەی وەکوو ئێرە.

کاك عومەر گوتی: بەڵێ لە گۆشەگیری و دوورکەتنەوە سەلامەتی دین و دونیا هەیە.

شێخ گوتی: ئەمە بۆ هەموو کات و شوێن و حاڵێك باش نیە، هەیە بۆی باشە گۆشەگیربێ هە شە واباشە تێکەڵی خەڵکی بێت، چۆن وەکوو یەکن ئەو دووەی یەکێ دەشێتە ناو خەڵك و فرمانی چاکەیان پێ دەکات و ڕێگری خراپەیان لێ دەکات، وەلێ کاتێ لە دەست خەڵکی سەلامەت نابێ" بێگومان ئەوکات گۆشەگیری بۆ تۆ و خەڵکیش باشترە.

پیرەژنێکمان بینی کە قژی سپی بوو، ڕۆژگار نیشانەی گەورەیی و چەمانەوەی پشت و ماندبوونی چەندین ساڵەی بە ڕووخساریدا جێهێشتبوو، پشتی چەماندبوبوویەوە و چاو و گوێی کز کردبوو، تەنێ جەستەیەکی لاوازی هێشتبوویەوە کە توانای هیچی نەبوو، چرچ و لۆچی ڕووخساری بەس بوون بۆ ئەوەی لە نا سۆریەکانی ژیانی بگەین، ئەگەرچی وەکوو خەڵکی ناوچەکە ڕەنگی ڕەشی تۆخ نەبوو، بەڵکوو ئەگەر لەبەر گەورەیی و بەساڵاچوونی نەبووایە جوانیەکەیت بە ئا شکرا دەبینی، گۆچانێکی کورتی هاوشێوەی بەژن و باڵای بە دەستەوە بوو، عەبایەکی ڕەشی وێنەی عەباکەی شێخ صەفای پۆشیبوو، شێخ صەفا ئەو عەبایەی وەکوو یادگاری نەنکی هەڵگرتبوو، ئەو نەنکەی کە پێشتر لە بارەیەوە گوتبووی: ئەو دایکم بوو دوای دایکی خۆم)

بزەیەکی بەڕووی ئێمەدا کرد و سلاوێکی لێکردین.

بە گەرمی وەلامماندایەوە: وەعەلەیکوموسەلام وەرەحمەتوڵلاهی و بەرەکاتهو .

ڕۆڵەکانم وا دیارە ئێوە غەریبەن و خەڵکیی ئێرە نین، بۆچی نایەنە ماڵم و شتێك بخۆن و تۆزێ پشوو بدەن و ماندووبوونتان دەرکەن، دوای ئەوەی گەشتێکی دوور و درێژتان کردووە، وەکوو دایکتانم گەر بێن منەتبارتان دەبم، ...

دەبینم جلی دەروێشانتان پۆشیوە، بێگومان ئێوە لەو سۆفیە پیرۆز و پاکانەن، گەورە دەبم گەر خزمەتتان بکەم ڕۆڵە کانم، ئامان نەکەن بڵێن ئەو پیرەژنە هەژارە خواردنی لە کوێ بوو، خواردن بە چێژە گەر سەلامەتی و خاوێنی پێوە بێت و کەسێك پێشکەشی بکات بە هیوای پاداشت و فەڕ، ڕۆڵەکانم هەموو فەڕ و بەرەکەتێك لەلایەن خوداوەیە.

ئافرەتەکە پێکەنی بە جۆرێك ئەو کەڵبانەی کە ڕۆژکار کەواندبوونی بە دەرکەوت. هەموومان ڕومان کردە جەنابی شێخ و چاوەڕێی ئەوە بووین وەلامی پیرەژنەکە بداتەوە؟

جەنابی شێخ بە جوانترین شێوە لەگەڵی ڕەفتاری کرد و قسەی خۆشی بۆ کرد و هەوڵیدا بە نەرم و نیانی داواکەی ڕەتبکاتەوە و ئافرەتەکەش بەسەر خۆیدا نەشکێتەوە، وەلێ ئافرەتەکە زۆرزان و هەڵکەوتە بوو، هەموو دەرگاکانی لەبەر دەم ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی داخست، جەنابی شێخ هیچ ڕێیەکی گومانی نەبرد تا داواکارییەکەی ڕەتبکەینەوە، بۆیە هەموومان لەگەڵی چووینە ماڵەکەی.

لە ڕێگادا سپاسی بە دەمەوەهاتنی ئێمەی کرد وەکوو بڵێی ئێمە ئەو چاکەیەمان لێکردبێت، هەروەها گوتی: چوار کوڕم هەیە و بەبینینتان زۆر دڵخۆش دەبن.

دوای ئەوەی پرسیاری ئێمەی کرد، جەنابی شێخ وەلامی دایەوە و بەسەرهاتی ئێمەی بۆ گێڕایەوە، پرسیاری ئەوەی کرد ئێمە کێین و لە چ وڵاتێك هاتووین؟ پیرەژنەکە گیانی گەنجانەی لە خوێنیدا دەسوڕایەوە، هەوڵیدەدا خۆشی بخاتە دڵمان، هەوڵیدەدا بە وشە ساکار و سادەکانی بمانخاتە پێکەنین و ڕووخسارە ساکارەکەشی دەرخەری ئەو ڕاستیە بوون، وشە و ڕووخساری نیشانەی ئەوەی پێوە دیار بوو کە ئەو پیرەژنە بە درێژایی تەمەنی خاوەن دڵ و دەروونێکی پاك و بێگەر بووە، لە سەروبەندی قسەکانیدا ئاماژەی بە مردنی پیاوەکەیدا و گوتی: ئەو چوار منداڵەشی بۆ بەجێهێشتووم.

کاتێ گەیشتینە ماڵەکەی، تەنێ خانوێکی تەواو سادەی مینا خانووی هەژارێکی بێدەرەتان بوو، ئەو هەژارانەی کە بەناچـــاری تێیدا دەمێننەوە و برســـێتیان دەردەکەن.

خانووەکە لە ژوورێك پێکهاتبوو، بێگومان ئەویش ژووری پیرەژنەکە بوو، ئەوەی تریش لە هۆڵێکی گەورە پێکهاتبوو و کەوتبوویە بەری ڕاســـتە، جگە لە هەندێ قاپ و تاوەی سورکردنەوە هیچیتری لێ نەبوو، ئاودەستەکە کەوتبوویە دەرەوە ماڵەکە.

سـلاٌومان لە چـوار کوڕەکەی کرد، لە ڕاسـتیدا وەکوو دایکیان ئاماژەی پێکرد بە هاتمان دڵخۆش نەبوون، چوون بە گەرم و گە شی وەکوو دایکیان پێشوازیان لێ نەکردین، بێگومان ئەو هەڵوێسـتەیان جورێك لە ناخۆشـی پێوە بوو، ئاشـکرایە شـتێك هەیە !! گومانم برد ئەو پیرەژنە نەخۆشـــیەکی دەروونی هەبێت یان تۆشیی خەلەفاوی بە سالآچون بووە بۆیە منداڵەکانی بە دڵ ڕوویان تێنەکردین.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچان بۆ نەدەکرا تەنێ ملکەچی دۆخەکە نەبێت، جەنابی شێخ لە کن یەکێك لە کوڕەکان دانیشـــت، منیش لە تەك کاك عومەر، هەموومان بە بێدەگی دانیشـــتین، تا لە نێوان جەنابی شـێخ و کوڕە گەورەکەیان گفتوگۆیەك درووســـت بوو، لەوانەیە ئەوە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی خەجاڵتی و شـــکانی بەربەســـتی نێوانمان. دواتر ئافرەتەکە هاتە ژوورەوە و دوو قاپی بە دەســـتەوە بوو لەبەردەم ئێمەی دانا، یەکیان پڕ بوو لە هەنگوین و ئەوەتریشـــیان جامە ماستاوێك بوو لەگەڵ پارچ نانێکی ڕەق و وشك، بەوپەڕی دڵنیاییەوە لەبەردەمی

تەنیاحاجی

Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەو کتێبە لەلایەن احمد عبدالرحمن**
**کراوە بە pdf و پێشکەش بە خوێنەر کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22



t.me/tanyahaji7

نزیکەی دە خولەك بوو دەربارەی "شـێخ مەهدی" دەدووا، تا وامان زانی ئێمە گوێگرین، وەلێ نازانین بۆ مندالّەکانی زۆر گرنگیان بە قسـەکانی دایکیان نەدەدا و تایبەت کاتێ قسە لەگەلّ بێگانەیەك دەکات!

لەوانەیە ئەمە لەگەلّ زۆربەی میوانەکان دووبارە بووبێتەوە، ڕەنگە ماوەی سـێ سـالّە ئەمە کاری بێت، لەوێدا هەموو شـتێك دەرکەوت، بەلێ هەلّە بووم کاتێ وامزانی نەخۆشـــە،.. ئەو نەخۆش نەبوو، بەلّکوو ئەو بەدوای بزربووەکەی دەگەڕا! ئەو بۆیە لەگەلّ بێگانەکان بەو شـێوەیە دەدوا بە هیوای ئەوەی سەرەداوێك دەربارەی ونبووەکەی بدۆزێتەوە و بەرەولای ئەوی ببەن.

قسەکانی بە تکاندنی فرمێسکێك لە چاوانی کۆتایی پێهێنا، هەموومان سەرمان نەوی کرد بەزەییان پێداهاتنەوە، لەوانەیە ئەوەی بە دوای دەگەڕێت کوڕی یان نزیکیی بێت.

شـێخ ئەحمەد ویسـتی قسـە بکات، ئافرەتەکە بە دەسـتێکی ئاماژەی بۆ کرد چاوەڕێ بکات و بە دەستەکەیتری ڕۆندکی چاوی سڕی و گوتی: وێنەیەکی ئەوم لەکنە دەتوانم پێتی نیشان بدەم، لەوانەیە بیناسیت.

فرمانی بە کوڕە بچووکەکەی کرد وێنەکەی بۆ بێنن، بە دلگرانی و ناڕەزامەندیەوە هەستایەوە بەلاّم هیچ هۆکارێکی بۆ ڕەتکردنەوەی نەبوو، تۆ خەیالّ بکە ئەوەی ڕوودەدات لە نێوان ئێمە و پیرەژنەکەیە و کوڕەکانیتری هەموویان لە لایەکی تر دانیشتوون.

هەرچـۆنێك بێت کوڕە بچـووکەکەیان وێنەکەی هێنا، کە بەتەنێ لە نێو قتوێکی چـوارگۆشـەدا دانرابوو، پیرەژنەکە وێنەکەی بە "شـێخ ئەحمەد" نیشـاندا، بە

سەر سوڕمانەوە " شێخ ئەحمەد "گوتی: بەڕێزم ئەو خا سێتانەی تۆ با ست کرد زۆربە یان لە شـێخە کەی من هاتوونە تە دی، تە نا نەت شـێخە کەم ناوی" مەهدی"یەکە و ماوەیە کۆچی دوایی کردووە وسەرجەلەیەکی پیرۆزیشی هەیە، بەڵام ئەو وێنەیە لە شێوەی ئەو ناکات.

لەوانەشـە ئەو وێنە یە ئی ماوە یەکی زووبێت و ئەو دە مە جە نابی شـێخم نەدەنا سی، لەوانە شە هەر وێنەی ئەو نەبێت، چارە سەری ئەو بابەتە ئەوەیە کە من وێنەکە ببەمەوە و بە کچەکەی کە دەکاتە خێزانم نیشانبدەم، ئە ستەمە ئەو وێنەی باوکیی نەناسـێتەوە، ئەوکات بە هەواڵی ڕاسـت و درووسـت دەگەڕێمەوە لات، تۆ چی دەڵیی؟

ئافرەتەکە هەسـتەکانی تێکەڵ بوون، هەسـتی دڵخۆشـی، چـوون خەریکە تروسکایی هیوایەکی بۆ درووست دەبێت، لەگەڵ هەستی دڵتەنگی، چوون ئەگەر ئەو کەسـەی ماوە یەکە بە دوایدا دەگەڕێت جەنابی "شـێخ مەهدی" بێت دەکەوێتە خەمێکی قوڵەوە، چـوون جەنابی شـێخ ماوەیەکە کۆچـی دوایی کردووە..

ئافرەتەکە بە ڕووخساریدا نیشانەی ئارامیی و تێکشکانی دیاربوو و گوتی: ڕۆڵە لە ڕاسـتیدا جگە لەو وێنە یە هیچ وێنە یەکی ترم نیە، گەر بزربێت و بۆم نە گەڕێتەوە .... قسە کانی تەواو نەکرد، سـەری نزم کردەوە و کەوتە بیرکردنەوەیەکی قوڵ.

جەنابی شـێخ قسـەکانی بڕیی و گوتی: متمانەم پێ بکە بەڕێزم، وێنەکە و کچـەکەی و منداڵەکانیت بۆ دەگەڕێنمەوە گەر بە ڕاسـتی ئەوەی بە دوای دە گەڕێت شـێخە کەم بێت. خۆ ئە گەر هەویش نەبێت وێنە کەت هەر بۆ

دەگەڕێنمەوە، ئەوەی لای تۆ جێگەی گرنگیە لای منیش جێگای بایەخە، بۆیە لە هیچ مەترسێ.

ئافرەتەکە ڕازی بوو وێنەکە بداتە شێخ ئەحمەد دوای ئەوەی پەیمانی لێ وەرگرت وێنەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، چوون وێنەکە یارمەتیدەری دەبێت لە دۆزینەوەی کوڕەکەی.

سەرسورمانی ئەوە نەبوو پیرەژنەکە ونبووەکەی بدۆزێتەوە، بەتایبەت گەر ونبووەکە شێخ مەهدی بێت، بەڵکوو ئەوەی بەڕاستی لام سەیر بوو ئەوەیە ئەو پیرەژنە چۆن ئەو ماوە درێژە ئارامی گرتووە و بێ ئومێد نەبووە، ئاخەر ماوەی سێ ساڵ گەڕان! ماوەی سێ ساڵ پرسیارکرن لە غەریبان و غەواران! بە هیوای ئەوەی کەسێك ڕێی ونبووەکەی پێنیشان بدات، تەنانەت منداڵەکانیشی بێهیوا بوون!.. سوبحانەڵڵا لە سەیری ئیشی ئەو پیرەژنە!.

## (٧)

جەنابی شێخ گوتی: بەڵام بەڕێزم چیرۆکی تۆ لەگەڵ "شێخ مەهدی" چیە؟ بۆچی ئەو ماوەیە دوور و درێژە بە دوایدا دەگەڕێیت؟

گوتی: مەهدی برامە، ئێمە پێش ئەوەی دایك و باوکم کۆچی دوایی بکەن خێزانێك بووین، من و مەهدی و ئیتریش، من بە دەست نەخۆشی هەرسکردنەوە

دەمنالاَند و پزیشکانی ولاَت دەسەوەستاند بوون لە چارەسەریەکەی، ئەوە و چەند ڕووداوێك لەگەڵ حەزی خۆی وایانکرد بۆ میسر گەشت بکات، ئەمەی بۆ ئەوەبوو لە زانکۆی "ئەزهەر" بخوێنێت، چوون ئەزهەر ئەوکات تژی بوو لە زانای بەناودەنگ، برام تاکە کەسن نەبوو لە ئەزهەر سوودمەند بووبێت، بەڵکوو پێشتر باوك و باپیریشمان لەوێ خوێندبوویان.

لەگەڵ برام گەشتم کرد، کاتێ گەیشتینە شاری" قاهیرە" خانووێکی بچووکمان نزیك ئەزهەرمان بە کرێ گرت، دواتر هەموو هەفتەیەك دوور ڕۆژ بۆ چارەسەری لەگەڵم دەهاتە لای پزیشك.

چارەسەریەکەم نزیکەی ساڵێکی تەواوی خایاند، دوای پێنج مانگ لە چارەسەری و مانەوەمان لە "قاهیرە" هەواڵمان لە هەندێ وەفدی ولاَتەکەمان پێگەیشت کە شیوعیەکان هێرشیان کردۆتە سەر لادێکەمان کە لە عەدەن بوو، کاولکاریی و خوێنێکی زۆری بێ تاوانانیان ڕشتبوو، خەڵکێکی زۆری لادێکە ڕایان کردبوو، هیچ کەس بە هەواڵی براکانمیان نەدەزانی، ماون یان مردوون؟ کوژراون یان وەکوو خەڵکی تری لادێ لە ترسی کوشتن و لەناوچوون هەلاَتوون.

بەو بەم شێوەیە هیچ شتێکمان لە دەست نەدەهات جگە لەوەی ئارام بگرین، جگە لەو برایەم مەهدی کەسی ترم نەبوو، لە ترسی تەنهاییم و بزربوونی زۆر پشتم پێدەبەست و ئاگاداری بووم، ئەوکاتیش کارەساتەکان بە تەنها نەدەهاتن، بەڵکوو ڕووداو کارەساتەکان لەگەڵ شەڕ و ئاژاوەکاندا شەپۆلیان دەدا و تورەبوونی خۆیان بەسەر خەڵکەکەدا بەتاڵ دەکردەوە، .

ڕۆژێك براکەم بۆ وانە خوێند چوو و نەگەڕایەوە! من و هاوڕێیەکی بە ناوی " موحەممەد" زۆری بەدوادا گەڕاین، تەنانەت هەموو قاهیرە گەڕاین و هیچ

شـوێنەوارێکمان لێ دەسـتنەکەوت، سـاڵێك مامەوە هەم بۆ چـارەسـەریی و هەمدیس بۆ گەڕان بە دوای ئەو، وەلێ هیچ سوودی نەبوو.

لە کۆتاییدا ڕادەسـتی کەتوار بووم، ئەو حاڵەی تێیدا بووم نەمدەتوانی جارێکیر بە تەنها بۆ وڵاتەکەم بگەڕێمەوە، چوون هەموو ئەو پارەیەی کە پێم بوو خەرجم کرد، تەنانەت موحەممەدی هاوڕێی "مەهدی"یش لە دووایین ڕۆژەکانی ئەوێم خەرجی کێشام.

دواتر موحـەمـەد خوازبێنی کردم، ئـەو داوایـەی مینـا هێدمـە بوو بۆم، بۆی باسـکردم ئەمە بۆ ئەوە نیە دڵی بۆم دەسـووتێ چـونکە ئافرەتێکی تەنهام و براکەم ونکردووە، بەڵکوو باسی ئەوەی کرد کە دڵی دەیەوێ هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات، ئەگەر ڕەزامەندی بنوێنم ئەوا دڵخۆش و کامەران دەبێت.

هەرچـۆنێك بوو هاوسـەرگیریمان کرد و بڕیارماندا دوای هاوسـەرگیریەکە قاهیرە جێبێڵین و بچینە سـوودان، چوون ژیانی ئەوێ وەکوو ژیانی قاهیرەیە و هێمن و بژێوی تێچـووی هەرزانە، لەو ئەو چـوار کوڕەم هەیە و پێش سـێ سـاڵ کۆچـی دوایی کرد.. ڕەحمەتی خودای لێبێت.

زۆر لەگەڵم ئارام بووە و بە درێژایی تەمەنی لە خەمی ونبوونی براکەم بووە و باری سەرشانمی سووك کردووە، چوون دەیزانی براکەم چەند خۆشدەوێ و چەند پێیەوە پەیوەستم.

لەو ڕۆژەوە من لێرە و لەوێ بە دوای هەواڵی ئەودا دەگەڕێم و بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژێ بۆنی یان هەواڵێکی ئەوم بۆ بێت، وەلێ تاکوو ئێستا هیچ هەواڵێکی ئەوم نیە.

بەڵام بە یارمەتی خودا وا هەســـت دەکەم کە ڕزگاربوونم نزیکە و لە هەموو حاڵێکدا هیوام بـە خودایـە، هیوادارم زینـدووبیێت بیگـەڕێنێتـەوە لام، گـەر مردوو شبێت خودا لێیخۆشبێت و ڕەحمی پێبکات، هیوام وایە بۆ جارێکیش بێت و بیبینم دواتر گەر بشمرم دڵئارام دەبم.

دوای گوێبیســـتبوونی ئەو بەســـەرهاتە –بۆ ئەو پیرەژنە دڵتەنگە– جگە لە باراندنی چەند دڵۆپێك فرمێسك چیترم لە دەست نەهات.

ئەمە وانەی خۆشـــەویســـتیی و وەفایە هەموومان لێیەوە فێر دەبین، تەنانەت ئەگەر شـــێخەکەم "مەهدی"یش نەبووایە بێگومان لەو ئافرەتە فێری باشـــترین ئیخلاس دەبووین و هەرگیز لەبیرمان نەدەکرد.

جەنابی شـێخ مۆڵەتی ڕۆیشـتنی لە ئافرەتەکە خواسـت، ئافرەتەکە پێشـنیاری ئەوەی کرد یەکێك لە کوڕەکانی لەگەڵ ئەودا بێن، بەڵام جەنابی شـێخ داواکـاریـەکـەی ڕەتکردەوە و پـەیمـانی پـاتـە کردەوە جـارێکیتر هـەواڵی بۆ بگەڕێننەوە، پێشنیارێکی تری بۆ کرد و زۆر داکۆکی کرد شەو لای ئەو بمێننەوە و بەیانی درێژە بە گەشتەکەیان بدەن، ئێمەش ڕەزامەندیمان نواند.

ماڵەکە لە ژوورێك پێکهاتبوو و ئەویتر هەمووی چـۆڵ بوو، کوڕەکان لەوێ دەخەوتن و ئێمەش هەر لەوێ خەوتین.

ئـەو دەمـەی ئێمـە خـەوتبووین کوڕەکـان یـەك بـە دوای یـەك بۆ شـــەونوێژ هەڵدەستان، وادیاربوو دایکیان باش پەروەردەی کردبوون، بەڕاستی ئافرەتێکی گەورە و سەنگین بوو!

ئێمەش وەکوو هەمووجار لە کاتی خۆی بۆ نوێژ و زیکر هەســـتاین، کاك عومەر لەگەڵ ئەوەی بەئاگابوو وەلێ هەڵنەســـتا، تێبینیم کرد جەنابی شـــێخ نوێژی

دابەست بێ ئەوەی دەستنوێژ هەلگرێت،.. وا دیاربوو شەو نەنوستبوو، پێدەچوو بە درێژایی شەو بیری لەو پیرەژنە کردبێتەوە و خەوی لێ تۆراندبێت.

کۆتاییمان بە نوێژ هێنا و هەریەکەمان مژوڵی زیکر و ویردەکانی بوو، وەلێ کاک عومەر هەر لە شوێنی خۆی دانیشتبوو، جەنابی شێخ پرسیاری لێکرد بۆچی بۆچی نوێژ ناکات؟ ئەویش بە دەنگێکی نزم گوتی: دووپشکێك بە پێی وەداوە، تەنانەت ناتوانێ لەسەر پێیەکانی بوەستێ، ئازارەکەی لە هەمووان شاردەوە تاوەکوو ئافرەت و کوڕەکان شەرمەزار نەبن، چوون زەوی و دیواری خانووەکە بووبوویە شوێنی مانەوەی مێروو و خشۆك.

جەنابی شێخ پرسیاری لێکرد گەر توانای هەبێت کەمێکیش بێت هەستێتەوە و مۆڵەت لە خاوەن ماڵ دەخوازین و لە ڕێگادا تیمارت دەکەم.

جەنابی شێخ مۆڵەتی لە پیرەژنەکە خواست و ئەویش مۆڵەتیدا، سپاسی کردین بەوەی لەگەڵ ئەو و کوڕەکانی ئارامگر و باشـڕەفتار بووین، هەروەها گوتی: چاوەڕێتانم و لە پشکۆ گەرمترم بۆ هەواڵتان، هیواشی خواست هەواڵی دڵخۆشکەری بۆ بهێنینەوە.

کاتێ دوور کەوتینەوە بۆ چارەسەری کاک عومەر لە شوێنێك وەستاین، بە هۆی پێوەدانی دوپشکەکە زۆر ئازاری هەبوو، بەڵام بەڕاستی بۆچوونی شێخ بەرامبەر کاک عومەر درووست و ڕاست بوو، کەسێکی دڵ پاك و خاوەن هەستکی باڵا بوو، تەنانەت جەنابی شێخ لەو بارەیەوە هەمان قسەی کرد و وتی ئەمە نیشانەی کامەرانی ئەوە و زۆری دڵی بەو هەڵوێستەی خۆش بووە و نزای بە خێریشی بۆ کرد.

لەو دەمەی لە ڕێگابووین لە دوورەوە چەند هەژارێکمان بینی، وادیاربوو کۆمەڵە هەژارێکی لادێ بوون و لە تەك یەك دانیشـــتبوون، چـــووینە گوندی "ئوم" و لەوێشەوە بۆ شارێکی دیکە لە ناوەڕاستی سوودان.

لەو عەسرەی کە لادێ پیرەژنەکەمان جێهێشت چووینە شار و لەوێشەوە وەکوو هەمیشـە بەرەو ئەو لادێیە بەڕێکەوتین کە لە خەیاڵماندا بوو و پێمانوایە باولەکی پڕ لە دوور و کانزای بەنرخە..

ئەو لادێیە وا دیاربوو پارێزگاری لەو ســـروشـــتەی خۆی کردووە و دەســـتی گۆڕانکاری پێنەگیشتووە و لەگەڵ ئەوەی کە هێزی گۆڕانی شارستانی بەهێزە، بەڵام ئەو ســـروشـــتیەی کە هەیەتی وایکردووە پارێزگاری لە بوونی بکات و سروشتە کۆنەکەی خۆی بپارێزێ.

خانووەکانی لادێکە لەڕووی شـێوازەوە جیاوازبوون، وەلێ هەموویان لە خشـتی قوڕ درووســـتکرابوون، خانووەکانی ئێرە خانووی زانایان و ڕێبوارانی تەســـەوفی کۆنم بیر دێنێتەوە کاتێ جەنابی" شێخ صەفا" بۆی باسدەکردین.

بیرێکی ئاوی لێبوو خەڵکی ئاویان لێ دەردێنا، خواردنمان خوارد و دەستنوێژمان گرت و نوێژەکەمان لای بیرەکە کرد، "جەنابی شێخ" لەوەتەی لەماڵی پیرەنەکە هاتووینەتە دەر بەردەوام ئاوەزی مژوڵی ئەوە..

گەیشـتینە ناەڕاسـتی لادێکە و بە دیداری خەڵکی لادێکە شـادبووین و لای ئەوان غەریبە بووین، چـــووینە بازار، ئەو شـــوێنەی کە بەردەوام هەواڵە نوێکان لەوێ دەبیســـترێ، گوێمان لێ بوو کە گەورەی لادێ، کە وەکوو کۆڵەگەیەك وایە بۆ لادێکە تووشی نەخۆشی گەدە بووە و بۆتە هۆی درووستبوونی ئازارێکی زۆر لە سکیدا و دووساڵە پزیشکان لە چارەسەریەکەی دەستەوەستانن.

لەو دەمەی لە ڕێگابووین لە دوورەوە چەند هەژارێکمان بینی، وادیاربوو کۆمەڵە هەژارێکی لادێ بوون و لە تەك یەك دانیشــتبوون، چــووینە گوندی "ئوم" و لەوێشەوە بۆ شارێکی دیکە لە ناوەڕاستی سوودان.

لەو عەسرەی کە لادێ پیرەژنەکەمان جێهێشت چووینە شار و لەوێشەوە وەکوو هەمیشــە بەرەو ئەو لادێیە بەڕێکەوتین کە لە خەیاڵماندا بوو و پێمانوایە باوڵەکی پڕ لە دوور و کانزای بەنرخە..

ئەو لادێیە وا دیاربوو پارێزگاری لەو ســروشــتەی خۆی کردووە و دەســتی گۆڕانکاری پێنەگەیشتووە و لەگەڵ ئەوەی کە هێزی گۆڕانی شارستانی بەهێزە، بەڵام ئەو ســروشــتیەی کە هەیەتی وایکردووە پارێزگاری لە بوونی بکات و سروشتە کۆنەکەی خۆی بپارێزێ.

خانووەکانی لادێکە لەڕووی شـێوازەوە جیاوازبوون، وەلێ هەموویان لە خشـتی قوڕ درووســتکرابوون، خانووەکانی ئێرە خانووی زانایان و ڕێبوارانی تەســەوفی کۆنم بیر دێنێتەوە کاتێ جەنابی" شێخ صەفا" بۆی باسدەکردین.

بیرێکی ئاوی لێبوو خەڵکی ئاویان لێ دەردێنا، خواردنمان خوارد و دەستنوێژمان گرت و نوێژەکەمان لای بیرەکە کرد، "جەنابی شێخ" لەوەتەی لەماڵی پیرەنەکە هاتووینەتە دەر بەردەوام ئاوەزی مژوڵی ئەوە..

گەیشـتینە ناوەڕاسـتی لادێکە و بە دیداری خەڵکی لادێکە شـادبووین و لای ئەوان غەریبە بووین، چــووینە بازار، ئەو شــوێنەی کە بەردەوام هەواڵە نوێکان لەوێ دەبیســترێ، گوێمان لێ بوو کە گەورەی لادێ، کە وەکوو کۆڵەگەیەك وایە بۆ لادێکە تووشی نەخۆشی گەدە بووە و بۆتە هۆی درووستبوونی ئازارێکی زۆر لە سکیدا و دووساڵە پزیشکان لە چارەسەریەکەی دەستەوەستانن.

دوای چەند کاژێرێك لە مانەوەمان لە لادێکە خۆمان بە کەلەبچەکراوی بینیەوەن بەتۆمەتی ئەوەی ئێمە دەمانەوێ پلان دژی گەورە سـیاسـیەکان دابڕێژین و هاتووین پشێوی لە وڵات درووست بکەین...

لەوانەیە خەڵکێك ئێمەی بینیبێت و وا گومانیان بردبێت ئێمە گوێبیستی هەواڵی نەخۆشکەوتنی گەورەی لادێ بووینە و دەمانەوێ پلانێك دژی ئەو بۆ بەرژەوەندی خەڵکێکی تر دابڕێژین! سیاسیەکان بەردەوام بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە.. ئەمە یاریە بێزەوەرەکەی ئەمانە، بۆیە دەبینی کە سـۆفیەکان قێزیان لە سـیاسـەت دەبێتەوە و ئاگاداریش توندیش دەدەن لە تێوەگلاَن لە سیا سەت و وە ستان لە دوای بەرژەوەندیەکانی.

لە ژوورێکی گەورە و تاریك کە کەوتووبوویە حەوشـەی ماڵێکی کۆن دایاننناین، بنمیچـەکەی بەرز و ترسـێنەر بوو، دوای ئەوەی هەرچـی هەبوو لێیان سـەندین، ئێمەیان بردە بەردەم بەرپرسـی شـوێنەکە، بەڕاسـتی هەر بەو شـێوەیە بوو کە باسیان دەکرد، تەنانەت نەیدەتوانی دابنیشێت! لەگەڵ ئەوەی زۆر نەخۆش بوو وەلێ زۆر وشـك و خراپڕەفتار بوو، بە ناشـرینترین شـێوە لەگەڵمان ڕەفتاری دەرکرد، پێشـتر لە ناوبازار پێیان گوتین: پزیشـکی زۆر بۆ چـارەسـەری ئەو هاتوون، بەڵام هاتنەکەیان بێسـوود بووە، تەنانەت خەڵکی هاتبوونە ئەو بڕوای کە جادووی لێکراوە، ئەو سـتەمکارە ئەو تۆمەتەی دابوویە پاڵ هەژارەکان، بێگومان دەسەڵاتداری ئەو لادێیە کەسێکی ستەمکار و گەوجە.

دەسەڵاتداری لادێکە پرسیاری کرد: ئێوە کێن و لە کوێوە هاتوون؟

جەنابی شێخ وەڵامدایەوە و گوتی: لە " ئەقسەرەوە هاتووین و جگە لە ڕێبوارێك چیتر نین.

- بە توورەییەوە گوتی: تۆ چاودێر و هەواڵگری نهێنی لە جلی دەروێشیدا، ڕاستی بێژە و درۆ مەکە.

+ ئێمە لەو زەویە فراوانەی خودا بۆ گەشت هاتووین، هیچ پێویستیەکی ترمان نیە.

- ئەها بڕوات پێ دەکەم، هەموتان ئازاد دەکەم و برێسکەکانتان بۆ دەگەڕێنمەوە، بەڵام نامەوێ جارێکیتر لێرە بتانبینمەوە.

+ سپاس جەنابی فرەمانڕەوا، بەڵام من پێشنیارێکت بۆ دەکەم لەوانەیە سوودی لێ ببینی.

- چیت پێیە و بە کورتی بۆم باس بکە.. بەرپرسەکە بە ئەستەم قسەی دەکرد، چوون نەخۆشیەکەی گەیشتبوویە پایان.

+ پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم کە بە ئیزنی خودا لە ماوەی ڕۆژێك لەو نەخۆشیەت چاك ببیتەوە..! بەڵام بە یەك مەرج.

- سەری خۆی بادا و بە گاڵتەجاریەوە گوتی: کەس نەما ئێوە نەبن؟ ئێوەی دەروێشان خەڵکێکی گەوجن، وا دەزانن کە پشت لە دونیاکردن و دەستهەڵگرتننتان لێی سودێکتان پێ دەگەیەنێت، وای بۆ دەچم ئەوە تەنها....

+ ئەوە باسی ئێمە نیە بەڕێزم، ناشمەوێ بزانم بۆچوونی تۆ دەربارەی دەرویێشان چیە، بۆچوونت چۆنە با وابێت، بەڵکو ئێستا من پێشنیارێك دەخەمە بەردەمت، یان ئەوەتا ڕازی دەبیت یان ڕەتیدەکەیتەوە و ئێمە بە سپاسەوە ئێرە جێدێڵین.

- ئەو مەرجەی دەتەوێ چیە؟ ئەمەی بە بێزاریەوە گوت.

+ لە ڕاستیدا دوو مەرجن:

یەکەمیان: بڕوام پێ بکەیت ئەوەی پێت دەڵێم هۆکاری نەخۆشیەکەتە و واگومان دەبەم بەڕاستی هۆکارەکەی دەزانی.

دووەمیان: ئەوەیە دەسەڵات جێبێڵیت، وەڵامی مەرجی یەکەم پێش مەرجی دووەم وەڵامدەدرێتەوە، پێش ئەوەی بە ئیزنی خودا چاك دەبیتەوە.

بەرپرسەکە زۆر تووڕەبوو گوتی: بەندیان بکەن و ئەو خەلەفاوە تێر قامچی کەن.

جارێکتر بۆ هەمان شوێنی بردراین، بەڵام ئەمجارە جەنابی شێخیان لە ئێمە جیاکردەوە و ئەم حاڵە بەردەوام تا ڕۆژی دواتر، جارێکیتر بۆ لای بەرپرسەکە بردراین، لەوێ جەنابی شێخمان بینی و شوێنەواری ئازارمان بە ڕووخساریەوە بینی و زۆر ماندوو دیاربوو، بۆ حاڵی شێخ زۆر ئازارم دەچەشت، بە هیوابووم قسەکانی لەگەڵ بەرپرسەکە بە ڕازیبوون بە ڕۆیشتن بێت و لەو لادێیە بڕۆین، بەڵام ئەمە ڕوووینەدا.

ئەوجارە بەرپرسەکە گوتی: هۆ دەروێش، گەر تۆ توانای چارەسەری منت هەیە ئەوا من پێشنیاری بەخشینی نیوەی ماڵەکەمت بۆ دەکەم، چی دەڵێیت؟

وادیاریوو کە بەرپرسـان لە بیری پێشـنیارەکەی شـێخ ئەحمەد دابوون، بۆچـی نا !نەخۆشـی وەك بەندیخانەیە، وای لێکردووە لە پەلوپۆی خسـتووە! هەموو خەزێنەی دونیا ناکاتە ساتێ ساخ و سەلامەتی، ئەو ڕاستیە تەنها نەخۆشان و دەردەداران دەیزانن.

جەنابی شێخ گوتی: ببوورن بەڕێزم، بەمە ڕازی نیم.

بەرپرسـەکە بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد: باشـە ئەوە دوایین پێشـنیارم دەبێت بۆت، نیوەی دەسەلاّم دەبەخشم، بە جۆرێك دەسەلاّت سنووردار دەبێت و دەسـەلاّتم سـنووردار دەبێت، نیوەی سـەرباز و خزمەتکارەکانت دەدەمێ و کەسمان سنووربەزێنی ئەوەکەیتر ناکەین.. چی دەڵێیت؟

پێی وابوو ئەمە دەبێتە هۆی فریودانی شێوە ڕازیی بوونی.

+ ببورە بەڕێزم، بەو مەرجە ڕازی نابم، ئەوەنەبێت کە پێشتر بۆم باسکردبوی.

- ئای چـەندە دەروێشـێکی گەوجی، ببەن بۆ بەندیخانە و تێر قامچـی بکەن.

دیسانەوە هاتینەوە لای بەرپرسەکە و ئەوجارەیان هەموومان لە یەك شوێن بووین، لێدانێکی بە ئازار و برینداركەرمان چەشت، زۆر لە شێخ تووڕەبووم، هیوامخواست هیچ کات نەمناسیبوایە، بەلاّم لای کەس ئەمەم نەوت، نازانم چ کاری بە کورسـی دەسـەلاّتە ! چ دەبوو ئەگەر بەو پێشـنیارەی کۆتایی بەرپرسەکە ڕازی دەبوو. بەڕاستی دەسەلاّت فریودەرە.

بەو حاڵەوە سـێ ڕۆژ لە ژێر ئازار و ئەشـکەنجە ماینەوە، تاقەتمان پروکا، جارێکیتر بردراینە لای بەرپرسـەکە، وەلێ ئەوجارە بەرپرسـەکە خۆی

دواخست، هیچ دەرەتانێکی نەبوو جگە لەوەی بە مەرجەکەی شێخ ڕازی بێت، بۆیە ڕازیبوون و پەیمان و بەڵێن بەرامبەر هەمووان نووسران مۆرکران، داکۆکی کرا لەوەی هەمووان پابەندی پەیمان و بەڵێنەکان بن بەو مەرجەی جەنابی شێخ تیماری بەرپرسەکە بکات.

جەنابی شێخ بەرەو ڕووی بەرپرسەکە چوو، ئەو لەسەر چوارپاکەدا ڕاکشابوو، جەنابی شێخ چەند جارێك دەستی بە سەر سکیدا هێناو چەند ئایەتێکی قورئانی خوێند و دڵنیا بوو کە خودا شیفای دەدات، هەموومان چاوەڕێ شێخ و دەرەنجامی ئەوەبووین ئەگەر چاکنەبێتەوە و ئاقیبەتمان خراپ و ناخۆش و گرتن و ئەشکەنجەدان دەبێت.

چەند خولەکێکی کەمی پێچوو بەرپرسە نەخۆشەکە چەند جارێك ڕشایەوە، تەنانەت ڕووخساری سوور هەڵگەڕا و بەردەوام دەکۆخی، ئەمە چەند خولەکێکی پێچوو و هەناسەی ئاسایی بوویەوە و بە ئاسایی هەناسەی دەدا، ئازاری گەدە و ئاوسانی نەما، سپاس بۆ خودا بەرپرسەکە هەستایە سەر پێ و پێخەفەکەی جێهێشت و زۆر دڵخۆش بوو، وەکوو ئەوەی هیچ کات نەخۆش نەبووبێت.

هەمووان بە دەنگێکی بەرزەوە گوتیان: ئەڵاهو ئەکبەر.. ئەڵاهو ئەکبەر، ژوورەکە لەگەڵ دەنگەکە دەلەرایەوە.

دوای ئەوە بەرپرسەکە سەیری جەنابی شێخی کرد و لە نێو خەڵکیدا وەستا و بە دەنگی بڵند هاواری کرد: هۆ خەڵکینە ئێمە پەیمانمان بەو پیاوی داوە و ئەوەتا

ئێمە لە بەرامبەر ئێوەدا پەیمانی خۆمان دەبەینە سـەر، هەواڵ دەگەیەنمە دەسڵاتی باڵا لە وڵات کە من دەسەڵات بۆ ئەو پیاوە جێدێڵم...

ئەو دەمە جەنابی شێخ گوتی: نا ..نا... بەڕێزم نامەوێ دەسەڵات جێبێڵی! من لەبەر کورسی و دەسەڵات ومالّ و سامان بەرگەی ئازار و ئەشکەنجەم نەگرتووە! هەموومان تووشـی هێدمە بووین، باشـە ئەگەر بۆ دەسـەڵات و پارە نەبووە ئەی مەبەستی چیە؟!

- کەواتە پێمان بڵێ ئەی دەروێش مەبەستت چیە لێی؟ لە پشت ئەمەوە چی هەیە ئێمە نایزانین؟

+ ئەمەم بۆ ئەوە کرد لەو ئانوسـاتەی پرسـیاری ئەوەت لێ بکەم: ئایا مالّ و سـامان و هەموو ئەوەی هەتە بە نرخترە یان ئەو لەشسـاخیەی ئێستات" دوای ئەوەی چـەند سـاڵێکە بە دەسـت نەخۆشـیەکەتەوە دەناڵێنیت؟ دوای ئەوەی بەرپرسەکە تۆزێ بیری کردەوە و لە مەبەستی شێخ گەیشت و گوتی: بێگومان لەشسـاخی بەنرخترە، چ لەوە ناخۆشـترە لە ناو جێگا بکەویت، چ خۆشـیەك دەبینیت کاتێك ناتوانیت لە ناو جێگادا قیت بیتەوە، بێگومان هەموو دنیاشـت هەبێت بە تەواوی شتەکانی ناویەوە ناکاتە لەشساخی.

+ ئەو پیسـیەی کە لە گەدەت هاتەدەر لە دونیا بەنرخترە، بۆچـی وا لەسـەری پێداگیریت و تێدەکۆشیت لە پێناویدا و دین و دواڕۆژتی بۆ دەکەیتە قوربانی؟

- بەرپرسـەکە بۆ هاتەپێشـەوە و بۆ ئەوەی دەسـتی جەنابی شـێخ ماچ بکات، جەنابی شێخ دەستی لەو دوورخستەوە، هەموویان لە مەبەستی جەنابی شێخ گەیشتن.

بەڕاستی زۆر بێنرخترە لەوەی کە خەڵکی لەسەر شەڕ دەکەن و کێبڕکێ دەکەن، زۆر لەوە بێنرخترە دینەکەمانی بۆ بفرۆشین.

بۆیە پەشیمانم لەو هەڵویستەم بەرامبەر شێخ دەربڕیی و داوام لە خودا کرد سەرکەوتووم بکات لە هاوەڵێتیکردنی، ئای چەندین وانە و ئامۆژگاری لەسەر دەستی ئەو فێربووین.

جەنابی شێخ سەیری بەرپرسەکەی کرد و گوتی: بۆت باسنەکردین هۆکاری نەخۆشیەکەت چیە؟ خر مەرجمان ئەوە بوو بۆمان باسبکەیت؟

- بەرپرسەکە گوتی: ئێستا هیچ دەرتانێکم نیە و ددانیپێدا دەنێم، وای بۆ دە چم تەنها بە هۆی نزای ستەملێکراوانەوە بیت، ئای چەند ستەمم لە هەژاران کردووە و چەندە مافەکانیانم زەوتکردووە، بێگومانم لەوەی تەنێ تیری نزای ئەوانە کە هیچ کات لە پێکان هەڵە ناکات.

لە سەر ئەو ستەمەم خەوتم، دەرگای ئاسمانیان بۆ کرایەوە و ئازاری من دە ستی پێکرد، بە خۆم دەگوت: سەرکەوتنی ئاسمان چەندە زوو دەگات و بە فریای هەژاران دەکەوێت، ئەوانەی هیچ سەرخەر و پشتگیریەکیان نیە !

دواتر بەرپرسەکە لە ناو خەڵەکەدا بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: من بەرامبەر ئەو ستەمەی لە کەسێکی لادێ کردوومە واز لە دەسەلاتم دێنم، دواتر داوای لێکردین میوانی ماڵەکەی بین، بەجۆرێك بەسەرهاتی ئێمە لێرەدا لەگەڵ ئەودا کۆتایی پێنەهات هەروەکوو خۆی ئەوە دەڵێت، بەڵکوو جەنابی شێخ ڕەزامەندی نواند و بە میوانداریەکەی ڕازیی بوو، دوای ئەوەی بە مەرجی گرت هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی پێشکەش نەکرێت، ئەویش ڕەزامەندی نواند، بەرپرسەکە

هەڵسوکەوتی لەگەڵ شێخ تەواو گۆڕابوو، لەوەی ڕوویدابوو زۆر پەشیمان بوو، بەڕێزەوە سەیری شێخی دەکرد و بە شێوەی خزمەتکارێك لەبەر دەستی جەنابی شێخ هەڵسوکەوتی دەکرد...

بەرەو ماڵە فراوان و گەورەکەی کەوتینە ڕێ، پرسیاری ناسنامەی ئێمەی کرد، جەنابی شێخ بە درێژی هەموو شتێکی بۆ باسکرد و لە کۆتاییدا گۆتی: من خەمبارم کە دەسەڵاتت جێهێشتووە، دەکرا بەردەوام بوویتایە و دادگەری و چاکەت بڵاو کردبووایە و خراپەی پێشووت بە چاکە گۆڕیبووایە.

- نەخێر قوربان، ئەوەندەی پێشوو بەسمە، ئەوەی ماومە دەیبەخشمە خودا و هیوام وایە لێمی وەربگرێت، ئەو زەوی و خاکەش جێدێڵم کە ستەم و زۆرداری منیان بینیوە، نامەوێ تەنانەت گوێشم لە ڕابردووە بێزەوەرەکەم بێت، هەموو ئەوەی داوامە لێتان ئەوەیە ڕێگەم بدەن هاوڕێیەتیتان بکەم و لەگەڵتان بم، بە ئێوە لە مانای ژیان گەیشتم، با لەگەڵتان بم و بە خزمەتکاریم ڕازی بن، شمەك و ئاوی دەستنوێژتان بۆ هەڵدەگرم... باوەڕم پێبکەن هیچ خراپە و شەرمەزاریەکتان تووش ناکەم، ماوەیەك لەگەڵتان دەبم و دەگەڕێمەوە، من چەند کوڕێکی گەورە و هاوسەرێکم هەیە، لە دووری من هیچ زیانیان پێناگات، تەنێ دەمەوێ بە هاوەڵی ئێوە شەڕەفمەند و سوودمەند بم، ئێوە چیدەڵێن؟

+ لە ڕاستیدا بەڕێزم ئەو گەشتە بۆ تۆ ناخۆش و قورس دەبێت، چوون تۆ وەکوو ئێمە بەرگەی ئەو ناخۆشیانەی گەشت ناگریت و

لێڕانەهاتوویت، لە ماڵەکەت لەگەڵ منداڵەکان و هاوسەرەکەت بمێننەوە باشترە بۆت، شتێك مەخە کۆڵت ئازارت بدات و نەتوانی لە سەری ئارام بگریت!

- قوربان لە ئێوە دەگەم، لەسەر ناخۆشیەکان ئارام دەگرم، دەمەوێ ببمە مرۆڤیکیتر و لە نوێوە دەست پێبکەم.

+ کەواتە ماتوڵ خۆت دەتەوێ دەبیتە هاوڕێی گەشتکەمان.

- هاوڕێیە دەروێشەکانم ئێستا دەتوانن بە"سەلیم" بانگم بکەن، ئەوە ناوی ڕاستەقینەمە کە پێشتر لەبیرم چووبوو، کەس بەو ناوەم بانگی نەدەکردم، تەنانەت کەسە نزیکەکانیشم!

سەلیم– بەرپرسی پێشوو– لەگەڵ ئێمە گە شتەکەی دە ستپێکرد و بووینە چوار کەس، من و شێخ و کاك عومەر و سەلیم، سەلیم تەمەنی نزیکەی پەنجا و پێنج ساڵ یان کەمتر بوو، ڕووخساری زۆر جوان بوو، شوێنەواری خۆشگوزەرانی و بەخششەکانی بە ڕووخساریەوە دیاربوو، بە هۆی هاوڕێیەتیکردنی ئێمە لە سەر هەمووان پێویست بوو بچینە شوێنێکی دوور، چوونکە سەرکەوتنی گەشتەکە لەوەدابوو کەس لە ئێمە نەزانێ بۆ کوێ دەچین.

## (٨)

چووینە ناو شارێك لە نزیك سنوورەكانی سوودان، سەلیم گوتی: تەنێ ناوی شارەكە دەزانێ، گەیشتینە ئەوێ و لە جادەكانی شارەكە دەسووڕاینەوە، بە پێ بەرەو لادێكە دەڕۆیشتین.

چووینە نێو یەكەم لادێ، لادێیەكی زۆر جوان و درەختەكانی چڕ وپڕ بوون، وەكوو چوانترین ناوچەی سەوزایی خۆی دەنواند، وادیاربوو خەڵكی ناوچەكە گرنگی زۆر بە كشتوكاڵ و چاندن دەدەن... پێش نیوەڕۆ بە چەند خولەكێكی كەم بەس بوو بۆ خواردنی چێشتێ، تەنانەت كاك سەلیم لەگەڵ ئێمەدا بوو وەلێ جەنابی شێخ بە توند و زبری هەڵسوكەوتی لەگەڵ دەكرد، نەمدەزانی هۆكاری ئەوە چیبوو! دەمگوت لەوانەیە ئەمە چارەسەرێكی شایستەبێت بۆ ئێستای ئەو، بێگومان ئەوكارەی حیكمەتێكی تێدایە و ئێمە لێی بێ ئاگاین.

لەوێدا مزگەوتێكی بچووك هەبوو، دیوارەكانی لە خشتی قوڕ بوون، بنمیچەكەی لە قەدی خورما بوو، زەویەكەی بە شێوەیەكی یەكسان خۆشكرابوو بۆ نوێژ، جەنابی شێخ وەكوو هەمیشە عەبایەكی پۆشیبوو و گۆچان و تەسبیحەكەی بە دەستەوە گرتبوو، جلی ئێمەش جیاواز بوو و جۆراو جۆر بوو، پێش بچینە ژوورێ لە كانیەكی بچووك دەستنوێژمان هەڵگرت، هەستم بە دوودڵی و ناكامەرانی كرد، تەواو وەكوو ڕۆژانی گیرانمان لە بەندیخانە! سوبحانەڵڵا ئەمە یەكەمجارە لە ماڵێك لە ماڵەكانی خودا هەست بە ئارامیی نەكەم!

خەڵكی لە نێو مزگەوت بە سەرسوڕمانی سەیریان دەكردین! نیگاكانیان تژی بوو لە پرسیار و لۆمە و سەرسوڕمان، وەكوو ئەوەی پێشتر لە ئێمەوە تووشی زیانێك

بووین! وا گومانم برد ئەو مزگەوتە ئی کۆمەڵێکی دیاریکراو لە خەڵکی بێت، لەوانەیە حەزنەکەن جگە لە خۆیان کە سیتر لە مزگەوتەکەیان نوێژ نەکات! ئەمە نەخۆشیەکی کوشندەیە و بەرۆکی ئەو گەلەی گرتووە، تا بۆتە هۆی لاوازی ئەو ئومەتە لاحەولە وەلا قووەتە ئیلا بیللا.

باوەڕمان بە خۆمان کرد کە هیچ شتێکی نائاسایی نیە، دانیشتین چاوەڕێی نوێژمان دەکرد، قامەت کرا و جەنابی شێخ لەلای چەپی کەسێکەوە ڕیزی بەست و ئێمەش لە تەك ئەودا..

دواتر ئەو کەسەی لە تەك شێخ وەستابوو لە ڕیزەکە هاتەدەر و بە لە ڕیزی دوواوە تەنها وەستا! ئەو کەسەی لە لای ڕاستی کەسەکە بوو ڕیزەکەی پڕ نەکردەوە،..

ئەوکات جەنابی شێخ هەستی کرد ئەوان گومانی خراپ دەبەن، بەڵام ئەوە چ گومانێکە وات لێ بکات لە تەنیشت برا موسڵمانەکەت نوێژ نەکەیت!!

ئایا ئەوان هەست بەو ناشیرینی پەرت و بڵاوی موسڵمانان و کەمبایەخیان ناکەن؟!

ئایا ئەو کەسانە بە نەزانیان بۆ سەر گیانی خەڵی نێردراون و وەکوو دەسەڵاتدار لە لایەن خوداوە بۆ لێپێچینەوە لە کردار و نهێنی خەڵکی نێردراون!!

نوێژمان تەواو کرد و هەموومان هەساین و لە مزگەوت هاتینەدەر... ڕاستەوخۆ کۆمەڵێك گەیشتنە لامان و یەکێ دەمڕاستیان بوو کە بە تەمەن لە هەموویان گەورەتر نەبوو، بە دەنگێکی وشك و زبر و تووڕەییەوە بانگی کردین، هەموومان وەستاین.

- ئێوە کێن، ئەمەی بە دەنگێك گوت کە تژی بوو لە هەڕەشە و ترساندن..

+ ڕێبواری ڕێگاین ... جەنابی شێخ بە دەنگێکی ئارام و لەسەرخۆوە وەڵامی دایەوە.

- واتە ئێوە لەو کۆمەڵە نین کە لە ئایین دەرچوون و ئایینی خودایان گۆڕیوە و درۆ و دەڵەسەیان تێکەڵ کردووە؟

+ نازانم مەبەستت کێن؟ چوون ئێمە لێرە غەریبە و بێگانەیەن، داوام لە خودایە لە دەرچوون لە ئایین و داهێنان تیایدا بمانپارێزێت و ڕێگامان بە ڕووناکی سوننەت ڕۆشن بکات.

- ئەهاا.. بەو شێوەیە.. لەوەتەی ئەو مزگەوتەمان بنیاتناوە پەیمانمان داوە هیچ یەکێ لەو دەرچووانە نەیەتە ناو مزگەوتەکە و تەنها بۆ خودابێت...

خۆیی و کۆمەڵەکە گەڕانەوە ناو مزگەوتەکە.

تێنەگەیشتم، بۆیە چووینە بازار لەوانەیە لەوێ باشتر ڕوونبێتەوە... کەمێ سووڕاینەوە و پیاسەمان کرد تا گەیشتین بە فرۆشیارێك، جەستەیەکی ڕێك و مامناوەند و ڕووخسارێکی جوانی هەبوو، لەکن باولەکەی- کە لە لقی دارخورما درووستکرابوو- دانیشتبوو و باولەکەی پڕ کردبوو لە لیمۆی زەردی گەورەی بۆنخۆش..

جەنابی شێخ لێی نزیکبوویەوە و سڵاوی لێکرد، ئەویش بە پەلە و توند وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و جەنابی شێخ باسی خۆی و مەبەستی هاتنی ئەو لادێیە بۆ پیاوەکە باسکرد،..

خاوەن ئەو دڵە سادانە هیچ گرنگی بە ڕیزکردن و جوانکردنی شێوازی دەربڕین نادەن، بەڵکوو بە سادەیی و ساکاریی و سروشتی خۆیان وشەکان دەردەبڕن..

کاتێ زانی ئێمە گەشتیار و بێگانەین، سوێندیخوار کە دەبێ لەگەڵی بچینەوە ماڵێ و لەگەڵی نان بخۆین. جەنابی شێخ ویستی داوای لێبووردن بکات، بەڵام پیاوەکە پێداگیربوو لەسەر داواکەی، داوای لە گەنجێك کرد لە جێگای ئەو دابنیشێ و ئەویش لەگەڵ ئێمە بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ.

ماڵەکەی زۆر لە ماڵی پیرەژنەکە سادەتر بوو، پیاوەکە بە تەنها دەژیا، لەو ماڵە زۆر هەستمان بە ئاسوودەیی کرد..

زۆر بە سادەیی و دڵفراوانیەوە لەگەڵمان هەڵسوکەوی دەکرد، بەخێرهاتنی ئێمەی کرد و پێخۆشحاڵی خۆی بە هاتنمان دەربڕی و هەندێ خواردنی بۆ هێناین، ئەویش لەگەڵ ئێمەدا دەیخوارد، کاتێ جەنابی شێخ باسی

بەسەرهاتی مزگەوتی بۆ گێڕایەوە دایە قاقای پێکەنین و گوتی: بەڕاستی ڕێکەوتێکی سەیرە و جێی پێکەنینە...

لەو لادێیە کۆمەڵێك لە سۆفی دەژین و گرنگی زۆریان بۆ پەرستشەکان هەیە، هەروەها کۆمەڵێکیتریش هەیە، ئەوانەی نوێژت لەگەڵ کردوون، ئەمانە زۆر ڕقیان لە سۆفیە هەژارەکان دەبێتەوە و گومانی زۆر خراپیان پێ دەبەن، تەنانەت زۆرجار لەسەر بچووکترین هۆ دەمەقاڵێ و گفتوگۆ لە نێوانیان درووست دەبێت!

لەو نێوەندەشدا کۆمەڵێکی تر هەن کە بەرپرسانی ئەو شوێنەن، ئەمان سەرپەرستی گفتوگۆ و دانیشتنەکان دەکەن و دەرفەت بۆ کۆبوونەوەی هەردوولا درووست دەکەن، زۆرجار ئەوان دەوری یەکلاییکردنەوەی هەردوولا دەبینن!

ناتوانم لەوە پتر بۆت ڕوونبکەمەوە، چوون من کەسێکی نەخوێندەوارم و هیچ دەربارەی ئایین نازانم، تەنێ نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم، هەروەك بینیتان ڕۆژی خۆم لە فرۆشتنی لیمۆ دەستدەخەم، بەڵام وایدەبینم ئەو خەڵکە ڕەشۆکەی پەرستش دەکەن و جگە لە توێکڵی ئایین چیتر نازانن، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لەو خەڵکە توندڕەوە خۆبەزلزانەی مزگەوتی ناوبراو باشترن.

جەنابی شێخ گوتی: بەڵێ تێگەیشتم... کەواتە لە جل و بەرگمان واتێگەیشتوون کە لەمانەبین کە دوژمنایەتی ئەوان دەکەن، هەر بۆیە بەو شێوەیە بە کەم و سوك سەیریان کردین ئەی وانیە؟

- بەڵێ هەر بەو شێوەیەیە.

+ ئەی هەڵوێستی گروپی سێیەم چیە لەو نێوەندەدا ؟

پەیوەندیان لەگەڵ هەردوو کۆمەڵەکە باش و پتەوە، خوداش باشتر لە نهێنیان شارەزایە، زۆرێك لە خەڵکی لەو باوەڕەن ئەمان بە نهێنی ڕق و قینە لەنێو ئەو دوو کۆمەڵەیە درووست دەکەن، بۆیە هەندێك لە گەورە پیاوانی وەك: شێخ ناسڕی کوڕی ئیبراهیم خەڵکیان لە ترسناکی ئەوانە ئاگادار کردۆتەوە.

+ شێخ ناسڕی کوڕی ئیبراهیم کێییە ؟

- کەسێکی بە ساڵاچووی خاوەن زانستێکی زۆر و فراوانە، زانستەکەی لە شوێنانی جیاواز بە دەستهێناوە، هەژاران و خەڵکە سادەکەی لادێ بۆ پرسیار و ڕاوێژکردن دەگەڕێینەوە لای ئەوە، جێی متمانەی هەمووانە، هیچ کارێ ناکەین بە بۆچوونی ئەو و تێگەیشتنی ئەو نەبێت، چوون ئەو کەسێکی زانایە لە ناومان– خودا تەمەنی درێژ بکات– بەڵام دوای بڵاوەبوونی نەخۆشی هەوکردنی گەدە گۆشەگیری هەڵبژارد، بەڵام لە ئامۆژگاریکردن بۆ ئامۆژگاریخوازان و ڕێنماییکردنی ڕێنماییخوازان درێغی نەدەکرد.

+ ئایا هەوڵی چاکردنی ئەو دۆخەی نەدەدا؟

- زۆر هەوڵیدا قوریان، تەنانەت گیانی خۆشی خستە مەترسی و خەریك بوو لەلایەن ئەو بەرپرسانەی ئێرە خۆی بە فەتارە بدات.

جگە لەوە ئەو دوو گروپە توندئاژۆیە هۆکاری سەرەکیی بوون لە سنووردارکردنی هەوڵەکان و بە بن بەستگەیشتنی، بۆیە وازی هێناو بە کاری خۆیەوە خەریك بوو و وازی لە کاروباری گشتی هێنا.

+ ئایا دەکرێ ببینم؟

- بەڵێ ... بەڵێ، ڕاستە ئەو زۆر دەرناچێ، بەڵام بینینی ئاساییە، بەیەکەوە دەچینە شوێنی گۆشەگیریەکەی و داوام لە خودایە یارمەتیمان بدات لەگەڵی کۆببینەوە.

+ کەی بچین؟

- ئەو شەو لە مەز من بمێننەوە و سپێدەی زوو دەچینە کنی ئینشائەڵڵا، هەروەکوو دەبینن من لێرە کەسێکی تەنهام، میوانە خۆشەویستەکانم گەر لەکنم بمێننەوە زۆر خۆشحاڵ دەبم، بەڵام پەیمانم بدەنێ هیچ چتێك لە ئاڵتوونەکانم نەدزن! هەروەکوو دەبینن من ئاوا لەبەر دەست و لەبەرچاوی میوانان دامناوە...

پیاوەکە پێکەنیی و ئێمەش پێکەنین، لە ڕاستیدا جگە لە چەند قاپ و تاوە و تەشتێکی گەورە چیتر لە ماڵەك نەبوو.

شەو لای فرۆشیارە خۆشڕەفتارەکەماینەوە و ماندوێتی گەشت و شەکەتی جەستەی لەسەر سووککردین، کەسێکی خوێن شیرین و قسەخۆش بوو، هەوڵیدەدا دڵخۆشمان بکات، وای نیشان دەدا کە ئەمە ئەرکێکە لە سەریی و

دەبێت بەرامبەر میوان ئەنجامی بدات، باسی بەسەرهاتی خۆی و هەڵوێستە پێکەنیناویەکانی دەکرد.

لە ڕاستیدا هەندێکیان ئەوەندەی بە ئازاربوون خەندە ئامێز نەبوون، بەڵام لە چاکیی کەسەکە و چەندبارەبوونی ڕووداوەکان پێدەکەنی، بەردەوام وانە لە ڕووانگەی بینی تۆ و خوێندنەوەی تۆوەیە بۆ ڕووداو و پێشهاتەکان، ئایا مینا ڕەخنەگرێکی وشیار خوێندنەوەی بۆ دەکەیت و لێی سوودمەند دەبیت یان پشتگوێی دەخەیت و وازی لێ دێنیت!

لە خەو ڕابووین و نوێژی بەیانیمان کرد و ویردەکانمان خوێند، گفتوگۆیەك لە نێوان بەرپرس و جەنابی شێخدا درووست بوو، ئاراستەی گفتوگۆیەکە بە جۆرێك بەلای بەرپرسەکە شکایەوە و گوتی: ئایا ژیانی ئەو کەسە سادە و ساکارەی بەدوای ڕۆزی خۆی دەگەڕێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە یان ئەو کەسەی خۆی بە قولابی دونیا هەڵدەواسێت و ژیانەکەی بە جۆرێك دەبێتە کێبرکێ و دەنگەدەنگ و کێشمەکێشم و چاوتەنگی؟

فرۆشیارە خۆشڕەفتارەکە قسەی پێ بڕین و سەری نەوی کرد گوتی: بەڕێزان من زۆر شەرمەزار و بە داخم! من هەموو کات خواردن بۆ ماوەی ڕۆژێك یان دووان لە ماڵ هەڵدەگرم، کاتێ دوێنێ...

جەنابی شێخ قسەکانی بڕی و گوتی: قوربان ئێمە داوای لێبووردنت لێ دەکەین بووین بە بارگرانی بەسەرتەوە..

بڕێ پارەی پێدا بۆ ئەوەی خواردنی پێنج کەس بۆ ماوەی هەفتەیەکی پێ بکرێت.

پیاوەکە دڵخۆش بوو و گوتی: ئایا بێگومان هەفتەیەک لای من دەمێننەوە... لە خۆشیان گورج هەستایە سەر پێ و هاواری کرد...

- برۆ پیاوی باش با دوانەکەویت هەروەکوو بڕیارمانداوە دەچـــینە لای شێخ ناسر. بە خۆشحاڵیەوە چوویەدەر.

سەرم سوڕمابوو لەو پیاوە باشە، چۆن پێداگیرە لە سەر میوانداری کردمان، لە کاتێکدا بەشـــی ئێمەی خواردن لە ماڵدا نیە!! لەوانەیە ئەمەی لەبەر پشـــت بەستنی بە خوداوە بێت.

کاک عومەر پرسیاری لە شێخ ئەحمەد کرد: قوربان، ئایا ڕاستە ئێمە هەفتەیەک لێرە دەمێنینەوە؟

جەنابی شێخ وەڵامیدایەوە: ئەگەر ناچاربووین بەڵێ، ئەگەرنا باوەڕناکەم تا شەو بمێنینەوە.. ئەمە لەسەر دیدارمان لەگەڵ جەنابی شێخ ناسر وەستاوە.

ئەوەندەی پێنەچـــوو خاوەن ماڵەکە بە خۆیی و خواردن هاتەوە و پیاوێکیشـــی لەگەڵ بوو، وێدەچوو ئەویش پێویستی بە مانەوە و شوێن بێت.

- ببورن ئەگەر کەمێک دواکەوتم، ئەوە بەڕێز " جەمال"ە، ئەمە لە گەور پیاوانە و وەکو من خودانی ئالتون و سامانی زۆرە. جەنابی شـێخ دایە قاقای پێکەنین.

فرۆشیاری لیمۆ کەسێکی قۆشمەچی و ژیرە.. دەیوست بڵێت لەمن هەژارترە، بەڵام نەیویست کابرا بشکێنێتەوە، بۆیە بە قسەی خۆش هەموانی تێگەیاند و دڵی کابراش گەردی نەگرت..

سڵاومان لە "جەمال" کرد و بەخێرهاتنمان کرد، کەسێکی کەمدوو و بە شەرم بوو. بەردەوام کۆڕ و دانیشتن لەگەڵ کەسانی سادە دڵ و دەروون خۆشدەکات، چوون کەسانی سادەن و خۆبەزلزانیان تێدا نیە و زۆر لە خۆیان ناکەن.

بۆ لای "شێخ ناسر" بە ڕێ کەوتین، وەکوو هاوڕێکەمان باسی کرد لە خەڵوەتگا سادەکەی بینیمان، .. ئەو شێخێکی مێزەر بەسەر و پشت لە دونیا و خۆشیەکانی بوو، لە شوێنی دانیشتنی دەیڕوانیە گۆڕەکەی، ئەمە وای دەکرد بەرە کاری چاك هەنگاو بنێت، لەو پیرەژنەی کە پێشتر بینیمان بە تەمەنتر بوو.

جەنابی شێخ بە دەنگە ئارام و نزمەکەیکەوە بە ئەستەم گوێت لێ دەبوو بەخێرهاتنی کردین، دەستمان ڕاموسی و لەلای دانیشتین.

هاوڕێی باشەکەمان بە دەنگێکی بەرز – دیاربوو جەنابی شێخ بە هۆی تەمەنی کەمبیست بوو– گوتی: قوربان ئەوانە ڕێبوارن، ئاوا و ئاوایان بەسەر هاتووە،– بەسەرهاتی مزگەوتی بۆ گێڕا یەوە– ئە ما نە هاتوون بزانن بۆچوونی تۆ دەربارەی ئەوەی ڕوویداوە چیە.

جنابی شێخ ناسر گوتی: لاحەولە وەلا قووەتە ئیلا بیللا..سەری باداو زۆر بە داخ بوو بۆ ئەوەی ڕوویدابوو، لە ڕاستیدا ئەمە کارەساتێکی گەورەیە،

زیانمەندی یەکەم تیایدا ئیسلامە و براوەش دوژمانیەتی، ئەوەی ئەوان ناتوانن بیکەن بەرامبەرمان و بە خەیاڵیاندا نایەت ئێمە لە بریی ئەوان دەیکەین، ئینا لیللاهی و ئینا ئیلەیهی ڕاجیعون.

لەسەرەخۆ درێژەی بە قسەکانیدا، بە دەنگێکی نزمەوە گوتی: لە ڕاستیدا وای دەبینم ئەمە دڕکێکە چۆتە پازنەی ئەو ئومەتە، بەو شێوەیە بانگخوازە درۆیینەکان و خەیاڵ پڵاوەکان دەتوانن هێزی گوێڕایەڵی ئەو ئومەتە لاواز بکەن لەو ئومەتە دەریان دەکەن، شتانێك دادێنن و ڕێگەی پێدەدەن کە ئایین ڕێی پێنەداوە.

شێخ ئەحمەد گوتی: قوربان سۆفیەکانی ئێرە چۆنن، لە ڕاستیدا ئێمە نەمان بینیون؟

- ڕۆڵی لەوەتەی گەیشتوومە ئەو تەمەن لێرە ژیاوم، پێشتر شتێ نەبوو بە ناوی کۆمەڵە و پیر، جگە لە پەرتووکی خودا و سوننەتی پێغەمبەر( د.خ) چتێکیتر نەبوو، سۆفیەکان وابەستەی ئایین و ئەو کەلەپورەن کە لە زانستی پێغەمبەرایەتیەوە ماوەتەوە، ڕێچکەی سۆفیگەری لە ( خودا فەرمووی... پێغەمبەر فەرمووی..) سەرچاوەی گرتووە..

مورید داخوازکاری زانست و ڕەوشتی باڵایە، شێخیش کەسێکی زانا و پەروەردکارە، نە نەستەم دەکات و نە سنووربەزێنی دەکات، نە زیادەڕەوی دەکات و نە کەمتەرخەمی،.. ڕێبوارانی تەسەوف کۆمەڵێکن لە خەڵکی مژوڵی زانست و فێربوون و تێگەیشتن و پێگەیشتنن، گەر سەیریان بکەی خودا بیردێتەوە، خودا بەخششی زۆر و پلەوپایەی مەعنەوی زۆری

پێبەخشیون و لە دڵی خەڵکیدا خاوەن شکۆ و پێگە و خۆشەویستن، داواکار و مەبەستی گەورەیان تەنها خودایە و ئەوەیان لە پەنهان و ئاشکرایان بە ئاشکرا دەبینرێ، ڕێبواری ڕێگەی گەیشتن بە خودا و بە پەنهان و ئاشکرایان لە هەوڵی گەیشتنن..

گوزەرانی خەڵکی باش و بارودۆخ ئارام بوو، دواتر بە تێپەڕینی کات و -سوننەتی خوداش ئەوهایە- بەرەو لاوازی چوون، بارودۆخ و گوزەران گۆڕا و وەکوو خۆی نەما، کۆڕی زانست نەما و نەزانی بڵاوبویەوە و دەمەقاڵێ و هەڵە پێشەوەیان گرت، ڕێگری لە هەندێ شت کرا کە نەدەبووایە ڕێگری لێ بکرێ و ڕێگەش بە بڵاوبوونەوەی هەندێ شت درا کە نەدەبووایە ڕێگەی پێبدرێت، شێخە پیرۆزەکان کۆچیان کرد و ڕیاباز و سوودمەندەکان پەیدابوون، تە سەوف ئێستا هەمان تە سەوف پێشوو و ڕیبازی پیاوچاکان و مەردانی خودا نیە.

هەموو ئەوانە و زیاتریش دەبنە هۆکاری ئەوەی- ئەوانەی لە مزگەوت ئازاریاندان- بوێری ئەوە ئەوە بکەن بەرەنگاری تەسەوف و خواناسان ببنەوە.

هەوڵێکی زۆرمدا بۆ نزیککردنەوەی هەردولا و بۆچوونیان و ڕوونکردنەوەی ڕاست بۆ خەڵکی، هەموو ئەوەی دەبوو ئەنجامی بدەن پێمگوتم، وەلێ لە هەوڵەکەم شکستمهێنا، چوون توندئاژۆ کوێرە و ڕاستی نابینێ و بە نابینێکێ، لەوانەیە لادێکەمان بۆ ئێوە شیاو نەبێت، من لە گیانتان دەترسم بۆیە بڕۆن بە سەلامەتی و ئێرە جێبێڵن.

گوێمان له وتەکانی شێخ بوو و لادێکه و لیمۆ فرۆشەکەمان جێهێشت و به شوێنی هاتنمان گەڕاینەوە، لەو شوێنەدا کۆتاییمان به گه شتەکەمان هێنا، جەنابی شێخ داوای لێبووردنی له لیمۆ فرۆشەکە کرد لەوەی ناتوانێ پەیمانەکەی بباتەسەر ئەمەش لەبەر ئەوەی بارودۆخەکە لەبار نەبوو بۆ مانەوە.

چۆن هاتبووین بەو شێوەیەش گەڕاینەوە، کاتێ بە لادێی بەرپرسە کە (سەلیم)دا تێپەڕین جەنابی شێخ پێشنیاری ئەوەی بۆ سەلیم کرد: دەتوانێ لەگەڵ ئێمە بۆ زانست بێتە "ئەقسەر" دواتر بگەڕێتەوە زێدی خۆی، یان ئێستا بگەڕێتەوە لادێکەی، بەڵام سەلیم شاری "ئەقسەر"ی هەڵبژارد کە ئەمەش بۆ ئەو باشتر و چاکتر بوو .

گەشتەکەی لەگەڵ ئێمە تەواو کرد و ئاراستەمان بریتی بوو له لادێی "ئەسوان" و لای شێخ "صەفا" پێشتر شێخ ئەحمەد پەیمانی پێدابوو بگەڕێنەوە لایی و سەردانی بکەن، من و کاک عومەریش گەڕاینەوە زێدی خۆمان.

هیواداربووم گەشتەکەم لەگەڵ شێخدا درێژتر بووایە و نزام کرد کە شێخ مۆڵەتم بدات جارێکیتریش لەگەڵی هاوڕێیەتی بکەم، یان جەنابی شێخ صەفا داوا له شێخ ئەحمەد بکات لەگەڵی بچمە " ئەقسەر" و دواتر بگەڕێمەوە، ئەو هیوایەشم هاتەجێ.

کاتێ گەیشتینە لادێ و دوای تامەزرۆییەکی زۆر بە جەنابی شێخ صەفا گەیشتین، دواتر پرسیاری جەنابی بەرپرس(سەلیم)ی کرد و گوتی: ئەمە کێ یە؟ شێخ ئەحمەدیش چیرۆك و بە سەرهاتی ئەوی بۆ باسکرد، شێخ صەفا

لەگەڵ شێخ ئەحمەد بۆ ماوەیەکی زۆر" لە عەسر تا ڕۆژئاوابوون بەیەکەوە دانیشتن، شێخ ئەحمەد تەواوی ڕووداوەکانی گەشتەکەی بۆ گێڕایەوە.

لە شەوەکەیدا بە تەنها لەگەڵ شێخ ئەحمەدا مامەوە و و بیرم خستەوە دەمەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ کچی کابرا هەژارەکە بکەم، ئەو پیاوەی ڕۆژێك داوەتی کردین، شێخ ئەحمەدیش لەوبارەیەوە لەگەڵ شێخ صەفا دوا و چوون بۆ خوازبێنی کچەکە و دایبابی کچەکە ڕەزامەندیان نیشاندا، بەوە زۆر دڵخۆش بووم، داوام لێکردن کە ماوەی گواستنەوەکە تا ساڵێکی تر دوادەخەم، لەو ماوەیەدا لەگەڵ شێخ ئەحمەد دەچینە لادێکەی و لە فێرگەکەی زانستەکانی سۆفیگەری زانستە شەرعیەکان دەخوێنم و دواتر دەگەڕێمەوە لادێ و وانەکان دەڵێمەوە، جەنابی "شێخ صەفا" ئەو داوایەی لە "شێخ ئەحمەد" کرد و خودا وەڵامی داواکەمی دایەوە.

دوو ڕۆژ لەو لادێیە ماینەوە، لە گەشتەکەمان و لە نەبوونی ئێمە لە لادێکە کۆمەڵێك شت ڕوویاندابوو.

ئەو گەنجەی کە جەنابی شێخی لە مەیخانەکەدا بینی بوو و دڵی بە شێخەوە پەیوەست بووبوو و پەشیمان بووبوویەوە و تەوبەی کردبوو، کۆچی دوایی

کردبوو، شـێخ ئەحمەد ویسـتی ئەوەبوو هەرکات بگەڕێتەوە قسـەی لەگەڵ بکات و سـەردانی بکات، بەڵام ئەجەڵ ئەوی بردەوە، دەڵێن ئاخیرخێربووە، سـپاس بۆ خودا... وادەردەکەوێ کاری بە ئامۆژگاریەکان کردووە و لەگەڵ خۆیدا تێکۆشاوە.

هەروەها ئەو کەسەی کە بە"شێخ یاسین"ناسرابوو کۆچی دوایی کردبوو، دوای کۆچـی دوایی موریدەکانی گلکۆیەکی رازاوەیان لەسـەر گۆڕەکەی بۆ چـێکردبوو، وایان دەزانی خاوەن ڕێز و پلە و پایەکی گەورەیە، بەڵام کوڕەکەی کە لەسـەر ڕێگەی باوکی نەبوو، دەچێتە ژووری باوکی، تا باوکی لە ژیان بوو بۆی نەبوو بچێتە ژووری باوکی، ولێ دوای ئەو دەچێتە ژوورەکە و دەبینێ کـە " یـاســـین"ی بـاوکی پـەیوەنـدی بـە "جن"ەوە هـەبووە خوداپەنامان بدات. ئەو بەو کارەی ئایینەکەی لە خەڵکی شێواندبوو.

لەوەوە بۆیان دەرکەوت کە ڕێبازی سـۆفیگەری بناغەکەی لەسـەر قورئان و سـوننەتە، ئەوەی لەسـەر دەسـتی درۆزنان و بەچـکە دەجالەکان لە شـتی سـەیر ڕوودەدات ڕەتکراوەن و خاوەنەکانیان لای ڕێبوارانی تەسـەوف باوەڕپێنەکراون، بەڵکوو ئەمان گەواهی لە ئایین دەرچوونی ئەوان دەدەن– خودا پەنامان بدات– یاسین کەسێك بوو لەوانەی لەو پێڕە بوون.

شـێخ صـەفا ددانی بەوەنا کە هەر لەسـەرەتاوە گومانی لە کاری یاسـین هەبوو، "یاسـین"یش دەیزانی کە "شـێخ صـەفا" لە مەردانی خودایە و ناڕاسـتی ئەوی ئاشـکراکردووە، ئەمە هۆکاری دژایەتیکردن و بەربەرەکانێی "یاسین" بوو لەگەڵ "شێخ صەفا"، ئەگەرچی پێشتر شێخ صەفا خەڵکێکی زۆری لە " یاسین" و کارەکانی ئاگادار کردبوویەوە.

شێخ صەفا بە شێخ ئەحمەدی گوت: گەورەپیاوانی مەغریب جارێکی تر هاتوونەتەوە و پرسیاری تۆیان کردووە، پێداگیریش بوون بەوەی هەرکاتێ گەڕایەوە نامەیەکیان بۆ بنێرم و هەواڵی گەڕانەوەتیان پێ ڕابگەیەنم... دەبێ شتێك بوبێت..!

شێخ ئەحمەد گوتی: پێوستە بگەڕێمەوە " ئەقسەر" و ناونیشانی خۆی دایە "شێخ صەفا" و جەنابی "شێخ صەفا" گوتی: هەرکاتێك پیاوانی مەغریب هاتن بەیەکەوە دێنە " ئەقسەر" و سەردانی دەکەن، هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن.

لە کۆتاییدا خواحافیزیمان لە جەنابی "شێخ صەفا" و "کاك عومەر" کرد، دەبوایە کاك عومەر کارەکانی لە لادێ تەواو کردبایە و دواتر لەگەڵ "شێخ صەفا" و پیاوانی مەغریب لە " ئەقسەر" سەردانیان کردباین.

## (٩)

گەیشــتینە لادێی ئەو شــێخەی پێش ئەوەی بیبینم لە خەیاڵی خۆمدا وێنەم کێشابوو، بەڵام لە ڕاستیدا لادێکە زۆر لەوە جواتر بوو کە لە خەیاڵمدا وێنەم کێشابوو.

فێرگەکە زۆرجوان و گەورە و ڕێك بوو، کوڕی شــێخ ئەحمەد کە ناوی "مـەهـدی" بوو گـەنجێکی بـاش و ژیر بوو، زەوی و بـازرگـانی بـاوکی قۆســتبوویەوە و دەســتمایەکەی لە گەورەکردنی فێرگەکە و فراوانکردنیدا خەرج کردبوو، فێرگەکە چوار بەش بوو: مزگەوت و بەشی زانست و شوێنی مانەوەی فێرخواز و بەشێکیشی بۆ مانەوەی مامۆستایان دیاریکردبوو.

مەهدی بە گەرم و گەشــی و پەرۆشــیەوە پێشــوازی لە باوکی کرد، بە شێوەیەك پەرۆشیم بۆ باوکم هەڵسا کە لێی بێ بەشم، بەڵام سپاس بۆ خودا بە "شــێخ صــەفا" بۆی قەرەبوو کردومەتەوە، کە هەم چــاکترین باوك هەمدیس چاکترین هاوڕێ بووە بۆم، جەنابی شێخ ئەحمەد زۆر دڵخۆش بوو کاتێ فێرگە وماڵباتەکەی بینیەوە.

یەکەمین شــوێن دوای گەڕانەوەمان بۆی چــووین لەگەڵ جەنابی شــێخدا مزگەوتەکە بوو، ماوەیەکی کەمی پێچــوو مزگەوت لە خەڵکی تژی بوو، خەڵکی لە هەموو لایەکی دەهاتن، هاتبوون بۆ بەخێرهێنانەوەی شــێخ و

پیرۆزبایی گەڕانەوەی، لە ڕاستیدا ئەو دیمەنە زۆردڵخۆشی کردم وتووشی هێدمە بووم، ئایا ئەو کەسەیە کە هاوەڵێتیم کردووە؟!

ئایا لەو پێگە بەرزەیە من نەمناسیووە؟

ئایا ئەوە ئەو کەسەیە کە ڕازیە بەند بکرێت و قامچی لێبدرێت و ئازار بدرێت تەنێ لەبەر ئەوەی پەیامێك کە پێی وایە دەرەنجامەکەی چاکسازی مرۆڤە؟

چاوم پڕ بوو لە فرمێسك، هەروەها "سەلیمی بەرپرس"یش، ئەمە هەمووی لە سەنگینی دۆخەکە بوو.

نەماندەزانی ئەوکەسەی هاوڕێیەتیمان دەکرد خاوەن پلە پایەکی ئەوها گەورەیە لە نێو گەلەکەی، خاکێتیەکەی بێ ئاگای کردین لەوەی وابزانین وەکوو هەر کەس و هەر زانایەکی ترە.

جەنابی شێخ کوڕەکەی ئامۆژگاری دەکرد، ئەو بووبوویە گەنجێکی خاوەن پێگە و یەکێ لە زانا دیارەکانی شوێنەکە، لە هەموو عەسری ڕۆژی هەینیان کۆڕی زیکری هەبوو، خەڵکی هاوتەمەنی خۆی و لە خۆی گەورەتر ئامادەی دەبوون، لەگەڵ خەڵکەکە پەیوەندیەکی بەهێزی هەبوو، کەسێکی باش و نەرم ونیان بوو، بە چاکە ئامۆژگاری ئێمەی دەکرد، ژوورێکی لە نێو ژووری فێرخوازان بۆ دیاریکردبووم، بەردەوام بە "شێخ" بانگی دەکردم، چوون نەیدەزانی لە چ حاڵ و پلەیەکدام.

هەفتەیەك بەسەر مانەوەم لە فێرگەکە تێپەری، کاتەکانم بە خوێندن بەسەر دەبرد، هیچ کاتێکی بەتاڵم نەبوو، نەمدەتانی خولەکێك بە فیڕۆ بدەم، لە خوێندن بۆ زیکر و لە زیکر بۆ بیرکردنەوە، لەوێش بۆ پشوودان و تێکۆشان،

له تێکۆشان بەرەو خەوتن و پشوودان... دەبوایە بەو شێوەیە بوومایە تا ئەوەم بە دەستهێنابووایە کە بۆی هاتبووم.

دەمویست لە ڕۆژی دووەمی گەیشتمان بە لادێك پرسیاری پیرەژنەکە لە جەنابی شێخ بکەم، ئایا جەنابی "شێخ مەهدی" برای ئەوە یان کەسێکی ترە؟

جەنابی شێخ سەردانی کردم و بێ ئەوەی پیرسیاری لێ بکەم دەربارەی پیرەژنەکە خۆی گوتی: شێخ مەهدی مامۆستاکەم هەمان ئەو پیاوەیە کە پیرەژنەکە بە دوای دەگەڕێ و برای ئەوە، هاوسەرەکەم" سوومەیە" دڵنیای کرمەوە کە وێنەکە وێنەی باوکیەتی، بەڵکوو وێنەیەکی تری دەرهێناو نزیك وێنەی پیرەژنەکە بوو.

دوای دوو هەفتە گەورە پیاوانی مەغریب هاتن و "شێخ صەفا"و "کاك عومەر"یان لەگەڵدابوو، جەنابی شێ ئەحمەد بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردن و زۆر خۆشحاڵ بوو، لە نێو بەشی مامۆستایان شوێنێکی بۆ پشوودانیان بۆ دیاری کرد و گەشتێکی ناساندنی فێرخوازان و مامۆستاکانی فێرگەکەی پێکردن، ڕۆژی هاتنیان ڕۆژێکی گەورە و لەبیرنەکراو بوو ئەگەرچی ئامادەکاریش بۆ هاتنەکەیان نەکرابوو.

ئەوکەرەتە مەردانی مەغریب چوار کەس بوون، سێیانم لە ئاهەنگی ئیسرا و میعراج لە لای "شێخ صەفا" و لە " ئەسوان" ناسیبوو، تەنێ کە سێکیان نەبێت نەمدەناسی و جاری یەکەم بوو بیبینم، شێخ صەفا پێی ناساندین و

گوتی: بەڕێزیان "شـێخ موحیەدیین"ە و ئەو هۆکاری هاتنی مەردانی مەغریببووە بۆ ئێرە.

- وەڵاهی گەر من هۆکاری هاتنی ئێوە بم بۆ ئێرە ئەوا هەموو تەمەنم قەرزار و منەتباری ئێوەم... جەنابی شێخ ئەحمەد ئاوای پێگوتن.

شێخ موحیەدین گوتی: من سپاست دەکەم بۆ ئەو کارانەت قوربان، بەڵام لە ڕاستیدا من بۆ کارێکی تر هاتووم، ئەگەرچی لای تۆ زۆر جێگای بایەخ نیە، بەڵام لەکنە من جێگای گرنگی زۆرە...

- فەرموو قوربان لە ژێر فرمانی تۆین.

لە چەند ساڵێکی ڕابردوو، چەند برا و تەنها خوشکێکم هەبوو، برامان" مەهدی" لەگەڵ خوشکمان بەرەو میسر گەشتیان کرد، ئەوەی ڕوویدا لە بارگرژی سیاسی و هەندێ ڕووداوی تر لە " عەدەن" ی زێدی ڕەسـەنی خۆی، وای کرد من و براکەم کرێ بکەین، براکەم مرد و دووەکەیتریشم ون کرد..!!
کاتێ لە جەنابی بەڕێز" ئەلحەبەشـی"یم بیسـت کە شـێخی جەنابت ناوی " مەهدی" بووە لە دەمی یەکێك لە گەورەپیاوان گوێبیسـتی بەسـەرهاتێکی شێخەکەت بووە، لەوانەیە ئەو شێخەی تۆ هەمان ئەو برایەمان بێت کە چەندین سـاڵە بە دوای دەگەڕێین، ویسـتم دڵنیا بمەوە لێی، لەوانەیە ئەو کەسـە برای ڕاستەقینەی ئێمە بێت.

جەنابی شـێخ ئەحمەد ئەو وێنەی کە پیرەژنەکە پێیدابوو لە گیرفانی دەریهێنا و نیشـانی "شـێخ موحیەدین"یدا و ڕووی گەشـایەوە، گوتیە شـێخ ئەحمەد: .. ئەڵاهو ئەکبەر.. ئەو وێنەیەت لە کوێ بوو؟

خۆم پێ زەفت نەکرا و فرمێسك لە چاوانم ڕێزیان بەسـت و بە گۆنامدا دەتکان، تا ئێسـتاش کەسـێك لە ئامادەبووان لەو باسـە نەگەیشـتن، تەنانەت شـێخ " موحیەدین"یش، جەنابی شـێخ ئەحمەد دەسـتی بە گێڕانەوەی باسـەکە کرد و باسی پیرەژەکەشی بۆ کردن.

شێخ ئەحمەد بانگی کوڕەکەی کرد بێت و سڵاو لە مامی دایکی بکات، کە ئەو لە جێگای باپیریەتی، یەکتریان لە باوەش کرد و نزای پیرۆزی بۆ کرد.

لەگەڵ جەنابی موحیەدین چـوون تا سـڵاو لە برازاکەی " سـومەیە" بکات، پێش ئەوە بەسەرهاتەکەی بۆ سومەیەی خێزانی گێڕایەوە، بەڕاستی گەر باسی پەند و وانەکانی ئەو بەسـەرهاتە بکەین زوبان لە ئاسـتیدا لاڵە، بەڵام هیچ ناڵێین تەنها ئەوە نەبێت: (( خودا هەرچی بیەوێ ئەنجامی دەدات)).

جە نابی شـێخ ئە حمەد بڕیاریدا دووای دوو ڕۆژێتر خۆی و کچـە کە و برای پیرەژنەکە کە شێخ موحیەدینە و کوڕەکەشـان کە ناوی " مەهدی"یە سـەردانی پیرەژنەکە بکەن کە دەکاتە پوری هاوسـەرەکەی! هەرچـی میوانانی مەغریب یش بوون دوای بیسـتنی بەسـەرهاتەکە بڕیاریاندا لەگەڵ "شـێخ صـەفا" لە " ئەقسەر" بمێننەوە تا ئەوان دەگەڕێنەوە.

شێخ ئەحمەد میوانانی بردە سەر گۆڕی "شێخ مەهدی" کە لە " ئەقسەر" بوو. شێخ موحیەدین دەربارەی سەرەمەرگ و مردنی شێخ مەهدی پرسیاری شێخ لە ئەحمەد کرد، ئەویش ئەوها وەڵامی دایەوە: سـپاس بۆ خودا ئاخیرخێر بوو و بە

حاڵێکی باش گەڕایەوە لای پەروەردگار، ئەویش لە خۆشـیان بزەی کرد و ڕووی گەشایەوە.

دوای ئەوە چـووینە سـوودان، پێش ئەوەی لە دەرگای ماڵی پیرەژنەکە بدەین، شـێخ ئەحمەد بە شـێخ موحیەدینی گوت: لەگەڵ ئێمەدا مەیە ژوورەوە، هەواڵی پێدەدەین، نەوەکوو هێمەگرتی بێت و شتێکی بە سەربێت، دواتر بانگت دەکەین بۆ ژوورەوە..

لە دەرگاماندا و کوڕە گەورەکەی دەرگای کردەوە، ئەوجارە پێچـەوانەی جاری پێشوو بە گەرم و گەشی بەخێرهاتنی کردین، هەمووومان چووینە ژوورە و شێخ موحیەدین لە دەرەوە چاوەڕوانی دەکرد.

پیرەژنەکە لە ژوورەکەی خۆی بوو، کاتێ ئێمەی بینی لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و بە هاتنمان هێدمەگرتی بوو، گوتی: کێنە؟ ئەو غەریبانەن کە ماوەیەك پێش ئێستا لامانبوون، بزانم چیتان لایە، هەواڵی خۆشە و خۆشی دەربڕم یان پرسـە دابنێم؟ دەترسـم بمرم هیچ هەواڵێکی "مەهدی"م پێ نەگات، تەمەنم هەڵکشاوە و ئەجەلم نزیکبۆتەوە، گەڕان بە دوای نزیکانم بێ سوود بووە..

پیرەنەکە ئەوەی گوت و چاوەکانی ڕۆندکیان تێ قەتیس بووبوو.

ئەو کات شـێخ ئەحمەد گوتی: دڵئارام بە دایەی پاك و باشـم، هاتووین هەواڵی دڵخۆشـکەرت پێ بدەین و فرمێسـکی چـەندین سـاڵەت بسـڕیت، گەر براکەشـت مردبێت ئەوە کچـەکەیەت و بەشـێکە لەو وا لەبەردەمت وەسـتاوە، ئەوەش کوڕەکەیەتی" مەهدی" نەوەی براکەتە.

پیرەژنەکە خۆی پێ زەفت نەدەکرا، لە خۆشیی و گریانی ئاوێتەی یەکتربووبوون، گۆچـانەکەی هەڵگرت و بەرەو کچ و نەوەی براکەی پێی هەڵگرت و باوەشـی بۆ کردنەوە و لە ئامێزی گرتن، نەیدەتوانی فرمێسکەکانی ڕابگرێت، ماڵەکە تژی بوو لە خۆشیی و شادی.

کاتێ شـێخ ئەحمەد هەسـتیکرد ئافرەتەکە ئارام بۆتەوە پێیگوت: دایە ئەمە هەموو هەواڵ و موژدەکە نیە!.

ئەویش بە سەرسوڕمان و چاوەڕونیەوە گوتی: چیتر هەیە لەکاتێك خودا دڵنەوای کردم بە کچە براکەم و نەوەکەی؟!.

- یەکێ لە براکانت هێشتا زیندووە.

ئافرەتەکە بە هێدمەوە گوتی: چیدەڵێیت؟ مەبەستت چیە لەمە؟

- هەروەك بۆم باسکردی... ئێسا ئەو لەگەڵمانە.

کوانێ؟ ئەو لە کوێیە؟

هەموومان هەسـتاینە سـەرپێ و شـێخ موحیەدین دەرگای کردەوە و هاتە ژوورەوە و خوشـکەکەی لە باوەشـکرد و بە یەکەوە فرمێسـکی خۆشـی و دووریان باراند و ئافرەتەکە لە هۆش خۆیچـوو و دوای چـەند خولەکێك واگاهاتەوە.

هەموو ئامادەبووان وانەیان وەرگرت و گریان بەسەریاندا خۆی سەپاند، کاتێ شێخ ئەحمەد ئەو دۆخەی بینی بە هەندێ بەسەرهات دۆخەکەی ئاسایی کردەوە.دواتر شێخ ئەحمەد پێشنیاری ئەوەی بۆ ئافرەتەکە کرد کە خۆی و منداڵەکانی بێنە " ئەقسەر" و لەوێ گوزەرانیان لێرە باشتر دەبێت، بەڵام شێخ موحیەدین سپاسی شێخ ئەحمەدی کرد و هەواڵی پێدا کە خۆی لەگەڵی دەگەڕێتەوە " ئەقسەر" و دواتر خوشک و منداڵەکانی دەگەڕێنەوە "عەدەن"ی زێدی ڕەسەنیان.

گەڕاینەوە ئەقسەر و "گەورە پیاوانی مەغریب" یش هەفتەیەك مانەوە و گەڕانەوە وڵاتەکەیان.

ئەوەی دەربارەی "شێخ ئەحمەد" یشە، تەنێ دوای ئەو ڕووداوە ساڵێك ژیا، بەشێکی ئەو ساڵەی بە گۆشەگیری و خەڵوەت بەسەر برد و ئەو پەرتووکانی کە ئێستا خەڵکێکی زۆر سوودی لێوە دەبینێ بەرهەمی ئەوکاتەن، دوای ئەوە ڕوحی پیرۆزی گەڕایەوە لای پەروەردگاری و وەسیەتی کرد کە بەرماڵ و تەسبیحەکەی لەگەڵ بنێژرێت و لەکن مامۆستاکەی" شێخ مەهدی" بنێژرێت.بە زوبانی بە ڕۆژووەوە بە چەند خولەکێك پێش نوێژی عەسر گیانی سپارد.ئا بەو شێوەیە وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاری دایەوە و لە دونیای خەڵەتێنەرەوە بۆ جیهانی کامەرانی و هەمیشەیی کۆچیکرد، خۆشی و شادی بۆ ئەو.

لەگەڵ خودا ڕاستیکرد و خوداش بەڕاستی ناساند.

خودای هەڵبژارد و خوداش ئەوی هەڵبژارد.

تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

**ئەو کتێبە لەلایەن احمد عبدالرحمن**
**کراوە بە pdf و پێشکەش بە خوێنەر کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7



ئەمە سرووت و هۆنراوەی کۆمەڵێک لە پاکانە، کە جۆرێک لە ئارامی ڕوحی باڵی بەسەریانەوە کێشاوە، کە وەڵامدەرەوەی داخوازی هەمووانە، ئای چەندە جوانە ڕوح لە کەسێکی پاک و بێگەرد لە شەقەی باڵ بدات و بۆ ماوەیەکی کەمیش لە جەستە جیابێتەوەز بەم شێوەیە موریدان دەوری شێخەکەیان دەدەن، ڕێک هاوشێوەی هەسارەکان؛ کاتێ دەوری خۆر دەدەن، و لە ڕووناکی و ڕۆشناییەکەی بەهرەمەند دەبن، کۆدەبنەوە و دەوری دەگرنز یان لەو وەسفانە دەکەن کە لە نێوان خۆیاندا بەکاریدەهێنن: ( مەی، مەیگێڕ، مەستان)

مەیگێڕ: "شێخ"ە یان سەروەر و قسەکەریانە.

مەی: گوفتاری شیرینی شێخە، لەناکاو بەسەریاندا تێدەپەڕێت و بە هۆیەوە کەمەندکێش دەبن، دەکەونە حاڵ تا لێواری بێهۆشبوون.

مەستان: ئەو کۆمەڵە کەسەی دەوری شێخن.

ئەمە دیمەنێک بوو لەو دیمەنە باوانەی ئێرە، کە ناوچەی سەعیدی میسرە، لە دێی "سەعید" سەر بەشاری ناوداری "ئەقسەرە"، بە تایبەت لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو. ئەو شارە لەو سۆفیانە تژی بوو، لەگەڵ زۆری ژمارەیان؛ جیاوازیان لە حاڵ و پلەیاندا هەبوو، لەناویاندا هەبوو موریدێکی ڕاستگۆ بوو، هەبوو شێخێکی تەواو، خواپەرستی ڕاستگۆ و خواناسی بەناوبانگ و دەروێشی هەژار هەبوون.


1234567890



هەولێر - داون تاون قاتی دووەم - ناوەڕاست
0750 406 66 74
Nawandi Raha / ناوەندی ڕەها